گۆڤـاری

ئەیووبی

گۆڤارێکی رۆشنبیری ئایینی وەرزی یە بۆ
ئاشناکردنی مرۆڤ لە ئایینی پیرۆزی ئیسلام

**خاوەن ئیمتیاز**

شێروان صادق علی

**سەرنووسەر**

سامی مصطفی حسن

**دەستەی بەڕێوەبردن و ئامادەکردن و دەرهێنان**

ئیسماعیل کریم قادر

بێوار فهمی سلیم

هێژا صباح حسن



**ناونیشان:**

هەولێر/ بەختیاری

**موبایل**

۰۷۵۰۳۰۳۰۲۰۲



https://www.facebook.com/ayobipage

Gmail: ayobigovar@gmail.com


بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ




# گۆڤـاری

# ئەیووبی

**ژمارە (١)**

**جمادی دووەم ١٤٣٧** **بەهاری ٢٠١٦**

﴿وَقُل رَّبِّ أَدْخِلْنِي مُدْخَلَ صِدْقٍ وَأَخْرِجْنِي مُخْرَجَ صِدْقٍ
وَاجْعَل لِّي مِن لَّدُنكَ سُلْطَانًا نَّصِيرًا﴾ الاسراء: ٨٠

## خطبة الحاجة:

إن الحمد لله، نحمده، ونستعينه، و نستغفره، و نعوذ بالله من شرور **أنفسنا**، و من سيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له، و أشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له، و أشهد أن محمداً عبده و رسوله.

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴾[1].

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴾[2]

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ۞ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ﴾[3].

أما بعد:

فإن خير الحديث كتاب الله، و خير الهدي هدي محمد صلى الله عليه وسلم، و شر الأمور محدثاتها، و كل محدثةٍ بدعة، و كل بدعةٍ ضلالة، و كل ضلالةٍ في النار.

---

(١) (آل عمران: ١٠٢).

(٢) (النساء :٢).

(٣) (الأحزاب: ٧٠ ـ ٧١).

# پێرست

## نزای دەست پێك...

**خوێنەری بەڕێز:**

**(خودا شوبهەت لێ دوور بخات، وە بتپارێزێ لە گۆمڕایی، وە لە نێوان تۆ و زانین بکاتە ناشنایی، وە لە نێوان تۆ و راستی بکاتە نزیکایی، وە وردبینی شیرین بکا لە بەر دڵت، وە ئینساف جوان بکا لە ناو دڵت، وە تامی تەقوادارى بخاتە زارت، وە سەر بەرزی ڕاستی بکاتە کارت، وە سینەت بە خۆشی یەقین فراوان بکات، وە داماوی بێ ئومێدی لەناو دەربکات، وە پێت نیشاندا کە ناحەقی ناشیرینییە تاوەکو لێی دووركەوی، وە فێرت بکا کە نەزانین کەم و کورتییە تاوەکو سەرکەوی)**

(ئەدەست کرییکی کەمەوە لە دوعەی ردوان بیژی
وەرگیراوە ـ کتاب خیوی ١ ـ ٣ ـ )

## دەست پێك:

ئێمەی دەستەی کارا لە دەرکردنی ئەم گۆڤارە (ئەیووبی)، یەك بەیەك وشە زێڕینەکانی میقداد مەدحت بەدرخان دووبارەدەکەینەوە کە لە یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی (کوردستان)دا دەفەرمووێت:

**(ئەز ڕێیا خودێدا دخەبتم ،**

**من ئەڤ جەریدە چێکر ڤێ ڕێ دە ،**

**ئەز گەلەك پارا سەرف دکەم وە زحمەتێ دکێشم، مەقصەدا من قەنجیيا کوردایە ،**

**هون ژی ژخێرا خودێ ڕا دەست هەلینن،**

**کوردا بدەن خوێندن ،**

**زارۆێن خۆ بعەلمینن علم و ئەدەبێ ،**

**بعەلمینن صنعەتا،**

**مرۆڤێن موسلمان دڤێ خوندابن، دڤێ بعەلمن دینێ خۆ...)**

ڕۆژنامەی کوردستان ژمارە (١)، لاپەڕە (١٣)

لە(٣٠ ذو القعدة ١٣١٥هـ) (٢٢نیسان ١٨٩٨م)

## سەر وتار:

مرۆڤی ڕێزدار نرخی **یەکەم ژمارەی ئەم گۆڤارە تەنها تەنوعیە کە** بخوێنیتەوە! خوێندنەوەیێك بو **تێگەیشتنی** مانا قۆڵەکانی خوداپەرستی، وە **زانینی لایەنە بەرز و** بزرەکانی کەسایەتی **پێغەمبەر** (صلی الله علیه وسلم)، وە ئاشنابوون **لەگەڵ** جوانی **ئیسلام**، وە ژیان **لەگەڵ قورئان**. وە دڵنیابە کە تەنها ئەم چوار بابەتە خۆشی دونیا و سەرکەوتنی دواڕۆژمان پێدەبەخشن، وە ئاشنامان دەکەن لەگەڵ مانای گەورەی ژیان، کە بەندایەتییێکی ڕاستەقینەیە بۆ خودای پەروەردگار، وە ئەم بەندایەتییە کاکڵەی بابەتەکانی ئەم گۆڤارەیە.

گۆڤارەکەش دیارییەکە بۆ هەر کەسێك کە حەزبکات ببێتە خوێنەر، ئەگەر خوێنەریش نەبێ. یان ویستی هەبێ ببێتە خودا ناس، ئەگەر خوداناسیش نەبێ. یان مەیلی بەندایەتی هەبێ بو خالق، ئەگەر تامی بەندایەتی خالقیشی نەکردبێ. یان هیوای ڕزگاربوونی هەبێ لە بەندایەتی مەخلوق، ئەگەر کەلەمچە پۆلایینەکانی ئەم بەندایەتییەش لە هەردوو دەستەکانیدا ئازاری بدەن. . .

ئەم گۆڤارە دیاری یە بۆ ئێمە چونکە مرۆڤین ! وە پێویستە ڕزگاربببین لە بەندایەتی بەندەکان بۆ بە بەندایەتی خالق، کە لەوێ، وە تەنها لە وێ سەربەستی هەیە. ئەم گۆڤارەش چەپکە گوڵێکی ئەو سەربەستییەیە کە لەسەر لاپەڕەکانی قورئانی پیرۆز و فەرموودەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) خۆی دەبینێتەوە، وە لێرەو لەوێ ی فیقهـ و ئەدەبی ئیسلام کۆکراوەتەوە، بە هیوای ئەوەی خودا لێمان قەبوول بکات، وە بە هۆیەوە زیاتر لەگەڵ ئیسلام ئاشنامان بکات، وە بەرەحمەتی خۆی لە دۆزەخ دوورمان بخاتەوە و بە بەهەشت شادمان بکات. **آمین** ﴿فَمَن زُحْزِحَ عَنِ ٱلنَّارِ وَأُدْخِلَ ٱلْجَنَّةَ فَقَدْ فَازَ ۗ وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا مَتَـٰعُ ٱلْغُرُورِ﴾[1]

---

[1] (آل عمران:١٨٥).

# ڕاڤەی لۆگۆی گۆڤاری ئەیووبی



**لۆگۆی گۆڤارەکەمان لە چەند بەشێك پێك دێت لەناو دوو بازنەی یەك لە دوای یەکدا کە ئەمانەن:**

## بەشی یەکەم:

دوو بازنەی یەك لەناو یەك، کە چوار ئامانجەکەی گۆڤارەکەمانی لە نێوانیاندا نووسراون، وە بە گوڵێکی سوور لێك جیا کراونەتەوە کە ئەمانەن:

※ (تێگەیشتنی خوداپەرستی).

※ (ناسینی کەسایەتی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم).

※ (ئاشنابوون لەگەڵ ئیسلام).

※ (ژیان لەگەڵ قورئان).

**کە ماناکانیان دیارە و لە چوار ئایەتی قورئان وەرگیراون:**

یەکەمیان: **تێگەیشتنی خوداپەرستی، وەرگیراوە لە ئایەتی(٥٦)ی سوورەتی(الذاریات):** ﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾ **واتە: (مەبەستی خودا لە دروستکردنی جنۆکە و مرۆڤ، تەنها ئەوەیە کە خودا پەرستی بکەن)**

دووەمیان: **ناسینی کەسایەتی پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم)، وەرگیراوە لە ئایەتی (٢١)ی سوورەتی (الأحزاب):** ﴿لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ﴾ **واتە: (ئەگەر**

بتانەوێ خوداپەرستییێك بكەن بەشێوە یێك كە خودا لێی ڕازی بێتە ئەوا تاكە نمونەی خودا پەرستی ئەوەیە كە پێغەمبەری خودا محمد (صلی الله علیه و سلم) پێی هەڵساوە بویە ئەم كەسایەتییە تاكە نمونە یە كە شوێنی بكەون لە چۆنیەتی خوداپەرستی ، وە بەدەست هێنانی ڕەزامەندی خودا).

سێیەمیان: ئاشنابوون لە گەڵ ئیسلام، وەرگیراوە لە ئایەتی (١٩)ی سوورەتی (آل عمران ): ﴿إِنَّ الدِّينَ عِندَ اللَّهِ الْإِسْلَامُ﴾ واتە: (تاكە ئایین كە لای خودا جێی ڕازیبوونە، ئایینی ئیسلامە، كە ئایینی هەموو پێغەمبەرانە (علیهم السلام)، وە دوا پەیامەكەشی قورئانی پیرۆزە).

چوارەمیان: ژیان لە گەڵ قورئان ، وەرگیراوە لە ئایەتی (٩)ی سوورەتی (الإسراء). ﴿إِنَّ هَٰذَا الْقُرْآنَ يَهْدِي لِلَّتِي هِيَ أَقْوَمُ﴾. واتە: (ئەم قورئانە پیرۆزە كە دوا پەیامی پێغەمبەرانە ڕێنماییە بۆ هەر كارێك كە باشترین بێ).

وە هەروەها ئەوەی پێویستە كە لە سەر ئەم چوار ئامانجە بزانرێت، ئەوەیە كە ئەم چوار ئامانجە پێویستە پێكەوە بە دەست بهێنرێن، هیچ كامیان بەبێ ئەوەی تر ناهێتە دی، بەڵام جیاوازیان ئەوەیە كە ئامانجی یەكەم (تێگەیشتنی خودا پەرستی) ئامانجی ئامانجەكانە، چونكە ناسینی كەسایەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وە ئاشنابوون لەگەڵ ئیسلام، وە ژیان لەگەڵ قورئان، گشتیان ئەگەر لە پێناو تێگەشتنی خودا پەرستی نەبێ، ئەوا لە ڕوانگەی شەرعەوە بێ سوودن!

هەر بۆیەش ئامانجی یەكەم لە بەشی سەرەوەی لۆگۆیەكە دانراوە. وە لە بەشی (چوارەمی) لۆگۆیەكە كە دارێك هەیە ئاماژە بۆ ئەم مانایە دووبارە دەكاتەوە ئەویش ئەوەیە كە دارەكە لە قەدێك و سێ لق پێك دێت، قەدەكە: ئامانجی یەكەمی گۆڤاردكەمانە كە(تێگەیشتنی خودا پەرستییە) ـ كە دەكاتە بنچینەی ئەو مەبەستەی كە مرۆڤ لە پێناویدا



دەژیت ـ وە سیّ ئامانجەکەی دیکەش سیّ لقەکەیە، کە لە لایەك ریّگان بۆ ئەم ئامانجە، کە بەهۆیانەوە خوداپەرستی تیّدەگەین، وە لە لایێکی ترەوە جۆریّکن لە خوداپەرستی.

## بەشی دووەم:

دوو هیلی تەریب کە چیّوەی بازنە بچووکەکەی ناوەوە بەیەك دەکەیەنیت کە لە ناوەراستی دوو هیّلەکە نوسراوە: A وB ئەمانەش چەند مانایەك دەبەخشن:

یەکەم: هیّمایەکە بۆ ناوی گۆڤارەکەمان (ئەیووبی)، چونکە بەخویّندنەوەیان ـ پیتی (A) ئینگلیزی وە (و ) ی کوردی وە (B ) ئینگلیزی ـ ئەم ناوە دروست دەبیّت. وە سەرکردەی موسلّمانی کورد (صلاح الدين الأيوبي ) دیّنیّتەوە یادمان، کە جیّی شانازی هەموو کوردیّکی موسلّمانە.

دووەم: A و B مانایەکی تر دەبەخشن ئەویش: ئەلف و بیّ یان A و B دەستپیّکی پیتەکانە لە کوردی و ئینگلیزی و زۆر زمانی تردا، وە ئەم گۆڤارەش دەستپیّکی نووسینیّکی نوێیە، بۆ پەروەردەکردنی مرۆڤ، ئەگەر موسلّمان بێ یان نا موسلّمان بەو پەیامەی کە محمد (صلى الله عليه وسلم) پیّهاتووە.

## بەشی سێیەم:

پەرتووکیّکی کراوە لە بەشی سەرەوەی دوو هیّلە تەریبەکەی ناو بازنەی ناوەوە.

مانایەکەی ئەوەیە کە بواری پەروەردەکردن لەم گۆڤارە، وەکو هەر گۆڤاریّکی پەروەردەیی بریتییە لە نووسینەوە. وە زانایان دەلّیّن: ئەوەی بەنووسین دەمیّنیّتەوە بۆ نەوەکان تەمەن دریّژتر و کاریگەرترە لەوەی بە ئاوەدان کردن وە شارستانی دەمینیّتەوە [1] پەرتووکەکەش کراوەیە وەکو بانگەوازیّك بۆ خویّندنەوە، چونکە گەورەترین نەخۆشی گەلان بریتییە لە

---

(١) ينظر: كتاب الحيوان للجاحظ ١\٧٥.

پشتگوێخستنی خوێندنەوە، **وە ئەم نەخۆشییە پاش پێشکەوتنی تەکنەلۆجیا زیاتر پەرەی** سەندووە!

## بەشی چوارەم:

دارێکە لە بەشی خوارەوەی دوو هێڵە تەریبەکەی ئەو بزنەی ئەوەوە.

لە ڕاڤەکردنی بەشی یەکەمی لۆگۆیەکە باسی مانای قەد و سێ لقەکانی دارەکەمان کرد، ئەوەی دەمێنێتەوە گەڵاکانی دارەکەن، کە لە سێ پیتەکەی ( A )ی ئینگلیزی وە ( و )ی کوردی وە ( B ) ی ئینگلیزی بەرەنگێکی سەوز پێك دێن کە رەنگەکە نیشانەی ژیانە، وە خوێندنەوەی سێ پیتەکە ناوی گۆڤارەکەمانە: (ئەیووبی). ئەمەش هیوا بەخشە و ئاماژە بەوە دەکات کە میللەتەکەمان لە ژیاندایە و دەتوانێ ڕۆڵەی وەکو صلاح الدین الأیوبي دروست بکات. وە لەناو گەڵایەکانی ئەم دارە چوار بەرهەمی سوور دیارن کە ئاماژەن بۆ چوار ئامانجی گۆڤارەکەمان، وە نیشانەی پێگەیشتنی ئامانجەکانی ئەم گۆڤارەن.

وە لە کۆتاییدا داوا لە خودای پاك و بەخشندە دەکەین، کە بە دڵۆڤانی خۆی ئەم ماندووبوونە لێمان قەبوول بکات، وە پاڵپشتمان بێت بۆ بەردەوام بوون لەم کارە پیرۆزە.



## (چەند وێستگەیکی هزراندن لە سەر لا پەڕەی یەکەمی قورئانی پیرۆز)

### گەشتێك بە ناو واتا بەرزەکانی سوورەتی (الفاتحه ١ ـ ٢٥)

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿١﴾

ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢﴾ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٣﴾ مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿٤﴾ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴿٥﴾ ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ﴿٦﴾ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ﴿٧﴾

یەکەم لاپەڕەی قورئان ـ مصحف ـ سوورەتی (الفاتحة) یە کە پوختەی ناوەڕۆکی گشت پەرتووکە ئاسمانیەکانی لەخۆ دەگرێت [1]، و مرۆڤی موسڵمان ڕۆژانە حەڤدە جار یان زیاتر لە نوێژەکانیدا دووبارەدەکاتەوە....

دەبێ نهێنییەکانی ئەم سوورەتە چی بن؟ یان چەند بن؟ یان چۆن بن؟ گەشتێك دەکەین بەناو ئەم نهێنییانەدا، نەك تەنها بۆ خودی نهێنیەکان، بەڵکو بۆ ئەوەی زیاتر لە قورئان و ئیسلام تێبگەین، وە زیاتر تام و چێژ لە نوێژەکانمان و خوداپەرستیمان وەربگرین، وە بەچاوێکی گەورەتر لە کەسایەتی پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم) رابمێنین، وە شوێنکەوتەی سوننەتەکەی بین.

پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم) لە وەسف و باسی پایەبەرزی سوورەتی (الفاتحة)دا دەفەرموێت: ((أعظم سورة في القرآن)) [2] واتە: (گەورەترین سوورەتە لە

---

(١) ينظر: مدارج السالكين ١\١٢٩.

(٢) بهذا المعنى أخرجه أحمد٤\٢١١ و البخاري٤٤٧٤ و غيرهما.

قورئاندا). وه له باسی گەورەیی ئەم سوورەته به **((أم القرآن)) ناودەبات و دەفەرمووێت:** ((أم القرآن عوضٌ من **غيرها و ليس** من غيرها عوضٌ منها))[1] **واته: (سوورەتی فاتیحە جێی سوورەتەکانی تر دەگرێتەوە، بەڵام** سوورەتەکانی تر جێی ئەو ناگرنەوە، بۆیه **بەدایکی قورئان ناودەبات).**

**له بەر هەموو ئەم مانایانه له سەر مانا بەرزەکانی ئەم سوورەته دەوەستین له چەند وێستگەیەکی بیرکردنەوە و هزراندنی ئایەتەکانی ئەم سوورەته پیرۆزە، بۆ ئەم مەبەسته لەم گەشتەدا له گەڵتان بە:**

## یەکەم:

### خاڵی دەستپێکردنی کاروانی خودا پەرستی له یەکەم وشەی فاتیحەوە دەست پێدەکات.

دەست پێکردنی قورئانی پیرۆز به سوورەتی: (الحمد)، وه دەست پێکردنی سوورەتی (الحمد) به: (الحمد). وه دەست پێکردنی وتارەکانی پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) به (الحمد) ئەمانه هەموو بەڵگەی ئەوەن که ئەگەر بتەوێ خوداناس بی، ئەوا ڕێگای خودا ناسین به (الحمد) دەست پێدەکات، که سوپاسگوزاری خودایه به گەوره دانانی خودا له دڵاندا، وه لەوێ وه تەنها لەوێ کاروانی خوداپەرستی بۆ ئەندامەکانی **جەسته دەست** پێدەکات، وه ژیان تەنها له یەك ئامانجدا کۆدەبێتەوە، که ڕازیبونی خودایه.

---

(١) أخرجه الحاكم في مستدركه١\٢٣٨و الدارقطني في سننه١\٣٢٢.

## دووەم:

### ناوەڕۆکی فاتیحە پێناسەی خودا پەرستییە.

خودا پەرستی پەیوەندییەکە لە نێوان دڵی مرۆڤ و ناو و سیفەتە بەرزەکانی خودای پەروەردگار، وە ئەم خشتەیە پەیوەندییەکەت بۆ نزیك دەکاتەوە:

| سیفەتەکانی خودا | هەستەکانی دڵی مرۆڤ |
|---|---|
| ﴿ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ (پەروەردگاری) | خۆشەویستی (حب) |
| ﴿ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ (خاوەن ڕەحمەت) | هیواداری (رجاء) |
| ﴿ مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ ﴾ (خاوەن پاداشت و سزا) | ترس لە تاوانباری (خوف) |

بە پێی ئەم خشتەیە زانایان دەڵێن: ئیمانی ئیماندار وەکو باڵندەیەکە کە سەرەکەی خۆشەویستی خودا بێ و باڵێکی هیوا بە خودا بوونە بۆ نزیك بوونە لە چاکە و باڵەکەی تری لە خودا ترسانە بۆ دورکەوتنەوە لە تاوانکردن.

بۆیە پەیوەندی دڵی ئیماندار لەگەڵ خودای پەروەردگار بە پێی ئەم مانایانە خۆی بە چەند شێوەیەکی تر دەخاتەڕوو، لەوانە پاراستنی مرۆڤ لە بنەمایەکانی هاوبەشدانانی بچوك کە شرکی گەورەی لێ هەڵدەقولێت کە بریتین لە:

١- ماڵ و سەرمایەی دونیا.

٢- جوانی دونیا بەتایبەتی جوانی ئافرەت.

٣- پایە و دەسەلاتی دونیا.

کاتێك کە ئامانج لە ژیانی دونیا دەبێتە یەکێ لەم سێیانە، یان دووانیان، یان هەرسێکیان، وە لە ئەنجامدا غەفلەت لە خودا و گەوردی ناو و سیفەتەجوانەکانی دروست دەبێ، ئەوە یەکەم هەنگاوی مرۆڤە بۆ ناو تاریکستانی هاوبەشی دانان بۆ خودا (شرك)، وە تێگەیشتنی سێ ئایەتە یەکەمەکانی فاتیحە مرۆڤ لەم ترسناکییە دەپارێزێت بە پێی هەمان خشتەی سەرەوە بەڵام بە مانایێکی تر:

| سیفەتەکانی خودا | هەستەکانی دڵی مرۆڤ |
|---|---|
| ﴿ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ (خاوەن پەروەردگارێك کە بەخشەرە بو گشت ماڵ و سەروەتێکی دونیا) | ئەگەر مانای ﴿ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ تێگەیشتین، ئەوا بومان دەردەکەوێت کە ئەو ماڵ و سەروەتەی هەمانە ئەو پێی بەخشیوین، کەواتە پێویستە لە رێگای ئەو دابێ وە لە ئەو نزیکمان بکاتەوە نەك پێچەوانە. |
| ﴿ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ (خاوەن ڕەحمەتێك کە سەرچاوەی هەموو جوانییەکی دونیایە ) | ئەگەر مانای ﴿ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ تێگەیشتین بۆمان دەردەکەوێت کە هەموو جوانییەك لە ڕەحمەتی ئەو هەڵئەقولێت چونکە نهێنیەکانی جوانی دونیا بو ڕەحمەتی ئەو دەگەڕێنەوە، ئەمەش ڕووی چاو و دڵ و دەروونمان دەکاتە جوانییەك کە حەلال بێ وە لە خودا نزیکمان بکاتەوە نەك پێچەوانە. |
| ﴿ مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ﴾ (خاوەن ڕەهای موڵك کە گشت موڵکێك لە ژێر دەسەڵات و فەرمانی ئەوە. | ئەگەر ماناکانی ﴿ مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ﴾ تێگەیشتین بۆمان دەردەکەوێت کە دەسەلات و مەلیکایەتی هەر هی ئەوە بەسەر هەموو دەسەڵات و مەلیکێك، کەواتە ئەو پلەو پایەی کە هەمانە یان بۆی هەوڵ دەدەین، با لە رێگای ئەودابێ بۆ چاکەکاری وە لە ئەو نزیکمان بکاتەوە نەك پێچەوانە. |



ژیان لەگەڵ ئەم مانایانە ژیانە لەگەڵ ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ ﴾ ئەنجامەکانیشی:

١ـ هەستانە بە ئەرکەکانی خودا پەرستی ﴿ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴾ وە دوور کەوتنەوەیە لە هەر شتێك کە دژی ماناکانی خوداپەرستی بێت.

٢ـ خۆراگرییە لە سەر ڕێگای ئیسلامەتی ﴿ ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ﴾ وە پاراستنە لە هەر هۆکارێك کە لەم ڕێگا ڕاستە دوورمان بخاتەوە.

وەکاتێ مرۆڤ بەم ئامانجانەدەگات گشت قسە و کردەوەکانی لە بازنەی ڕازیبونی پەروەردگار دەرناچن، ئەمەش تەواوی بەندایەتییە بو پەروەردگار[١] .

## سێیەم:

### بابەتی فاتیحە جیاوازی نێوان ڕێگای پێغەمبەران( علیهم السلام ) و ڕێگای فەلسەفەزانەکان دیاردەکات لە خودا پەرستی و خودا ناسیدا

ڕێگای فاتیحە بۆ خودا پەرستی ڕێگایێکی گونجاوە لەگەڵ فیترەتی (الفطرة) مرۆڤ، کە هەست کردنە بە شایستەیی خودا بۆ پەرستن (توحید الألوهیة ـ إیاك نعبد ـ)لە ڕێی بیرکردنەوە لە دروست کراوەکانی خودا (توحید الربوبیة ـ رب العالمین ـ) ئەمەش ڕێگای گشت پێغەمبەرانە (علیهم السلام) بە پێچەوانە ڕێگای فەلسەفەزانەکان، کە هەموو کۆششیان بۆ سەلماندنی هەبوونی خودایە، کە ئەمەش ڕاستییەکی بەڵگە نەویستە تەنانەت گەورە کافرەکانی مەککە دانیان پێدەنا دەیان گوت ﴿ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلْفَىٰٓ ﴾[٢] واتە: (پەرستنمان بۆ ئەم بتانە بۆ ئەوەیە لە خودا نزیکمان بکەنەوە) وە دەیان گوت:

با للات و العزى ومن دان دينها      و بالله إن الله منهن أكبر [٣]

---

(١) ینظر: العبودیة لشیخ الإسلام ص\١٩ ط: دار ابن حزم.

(٢) (الزمر: ٣).

(٣) كتاب الأصنام للكلبي ص ١٧.

واتە:(سوێند بە (لات) سوێند بە (عوزا) ـ کە دوو بتی موشریکەکان بوون ـ وە سوێند بەخودا کە لە هەردووکیان گەورەترە! )

کەواتە بە ناسینیان بۆ خودا کە هەیە وە لە هەموو شتێك گەورەترە وە داهێنەری گەردوونە لە بازنەی شیرك دەرنە هاتوون، کە ئەم ناسینە بە بەڵگەی عەقڵی دینداری فەیلەسوفەکان یەك خودا پەرستییە!!. ئەمەش هەڵەیەکی گەورەیە [١] .

ڕاستییەکەی ئەوەیە کە خودا بە فیترەت دەناسرێت، بۆیە پێغەمبەران (علیهم السلام) باس لە خوداپەرستی و چۆنیەتی خودا پەرستی دەکەن (توحید الألوهیة ــ کە بابەتی فاتیحە و هەموو پەرتووکە ئاسمانییەکانە ــ)، نەك سەلماندنی هەبوونی زاتی پیرۆزی خودای پەروەردگار، هەموو مرۆڤێك بە فیترەت دان بەمەدێنی بێ ئەوەی لە تاوانی هاوبەشدانان بوخودا(الشرك بالله)دەربێ.

## چوارەم:

## هەستکردنی مرۆڤ بە ملکەچی بوونەوەر لە جووڵەو قسەکردنیدا بۆ خودا، بەرهەمەکەی هەستکردنە بە تەنها شایستەبوونی سوپاسگوزاری ( حمد ) بۆ خودا.

لە ماناکانی پەروردگاری خودا (الربوبیة ـ رب العالمین ـ) تەنها شایستەبوونی ﴿الحمد﴾ بۆ ئەو، چونکە ـ وەك لە قورئانی پیرۆزدا باس کراوە ـ هەر تاکە مخلوقێك لەناو ئەم بوونەوەرە کە جوولە دەکات بەپێی ویست و ڕەزامەندی خودا جوولە دەکات، هەروەها کە قسە دەکات بە پێی ویست و ڕەزامەندی ئەو قسەدەکات، کە زانایانمان بەمەدەڵێن ڕاستی گەردوونی (الحقیقة الکونیة).

---

( ١ ) ینظر: درء تعارض العقل و النقل ١\٢٢٥، ٩\٣٤٥ـ٣٧٧.

سەبارەت بە **جوولە** (الحركة) وە كو باسكردنی **قورئان لە جوولەی ڕۆژ و مانگ**: ﴿وَالشَّمْسُ تَجْرِي لِمُسْتَقَرٍّ لَّهَا ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ ۝ وَالْقَمَرَ قَدَّرْنَاهُ مَنَازِلَ حَتَّىٰ عَادَ كَالْعُرْجُونِ الْقَدِيمِ﴾[1] ، **وە چیا و شاخ** ﴿وَتَرَى الْجِبَالَ تَحْسَبُهَا جَامِدَةً وَهِيَ تَمُرُّ مَرَّ السَّحَابِ صُنْعَ اللَّهِ الَّذِي أَتْقَنَ كُلَّ شَيْءٍ إِنَّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَفْعَلُونَ﴾[2] ، **وە زەوی و ئاسمان** ﴿ثُمَّ اسْتَوَىٰ إِلَى السَّمَاءِ وَهِيَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ائْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَا أَتَيْنَا طَائِعِينَ﴾[3] ، وە **سەبارەت بە قسەكردن:** ﴿تُسَبِّحُ لَهُ السَّمَاوَاتُ السَّبْعُ وَالْأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ وَلَٰكِن لَّا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ إِنَّهُ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا﴾[4]

**هەموو ئەم جوولە و قەسەكردنەی بونەوەر كە لە ماناكانی گەورەیی پەروەردگارە(توحيد الربوبية)، بانگەوازێكە بۆ مرۆڤ كە هەموو جوولەو قسەكردنێكی لە ڕێی خودا دابێت (توحيد الألوهية) وە ئەمە مانایەكە لە ماناكانی شایستەی** ﴿الحمد﴾ **تەنها بو** ﴿رب العالمين﴾ **كە زانایانمان پێی دەڵێن: ڕاستی شەرعی (الحقيقة الشرعية).**



---

(١) (يس:٣٨-٣٩).

(٢) (النمل: ٨٨).

(٣) (فصلت:١١).

(٤) ( الإسراء:٤٤).

# پێنجەم:

## تێگەیشتنی ماناکانی (الحمد لله) ڕۆتین و عاداتی ڕوژانە دەگۆرێت بۆ دین و عیباداتی ڕۆژانە.

هەستکردن بە ماناکانی ﴿الحمد لله﴾ دەرئەنجامەکەی ئەوەیە کە جیاوازییەك دروست دەبێت لە نێوان چۆنیەتی بەجێگەیاندنی فەرمانەکانی خودا، وەکو دینداری و بەجێگەیاندنی ئەرکەکانی تری ژیان ، وەکو بەجێگەیاندنی فەرمانی کەسانی تر لە ژیانی ڕۆژانەدا. جیاوازیەکەشی ئەوەیە کە بەجێگەیاندنی فەرمانەکانی خودا، بەگەورە دانانی خودا و خۆشەویستی خودا و هیوا بە پاداشتی خودا و ترس لە خودا ـ کە ماناکانی (الحمد)ن دەبێ بوونیان هەبێ لە کات و باری بەجێگەیاندنی فەرمانەکانی خودادا وەکو مەرجێك بۆ ڕاستی خودا پەرستی. بەڵام بەجێگەیاندنی ئەرك و فەرمانەکانی تری ژیان ئەم مەرجەیان تێدانییە، هەرچەندە هەبوونی مەرجەکە کارەکانی ڕۆژانە لە (ڕۆتین)ەوە بەرز دەکاتەوە بۆ (دین) وە هەڵسوکەوتەکانی مرۆڤ لە (عادات)ەوە پاك دەکاتەوە بۆ (عیبادات).

ئەمەش جیاکردنەوەی عیبادەتە (پەرستن) لە عادات(دابو نەریت)، کە لە قورئاندا بە زۆر شێوە ئاماژەی بۆ کراوە لەوانە: ﴿يَوْمَ يَدْعُوكُمْ فَتَسْتَجِيبُونَ بِحَمْدِهِ﴾[1] واتە: (کاتێ کە خودا بانگتان دەکات ملکەچیتان وە بە بەجێگەیاندنتان بۆ فەرمانی خودا وەکو هەر ملکەچییەك و بەجێگەیاندنێك نییە، بەڵکو تێکەڵە بە سوپاسگوزاری خودا ـ الحمد).

وە ئەمە لە گشت کردەوەکانی (دڵ) دا هەیە وەکو مەرجێك کە کاری دڵ ببێت بە پەرستن بو خودا وەکو لە سوورەتی (الفرقان ٥٨): ﴿وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱلْحَيِّ ٱلَّذِى لَا يَمُوتُ وَسَبِّحْ بِحَمْدِهِۦ وَكَفَىٰ بِهِۦ بِذُنُوبِ عِبَادِهِۦ خَبِيرًا﴾ واتە: (پشتت بە خودا گەرم بێ کە زیندووە و نامرێ، وەکاتێ پاك و بێگەردی بۆی ئەنوێنی لە دڵت دا هەست بە گەورەیی ئەم خودایە بکە کە خۆی ئاگادارە لە تاوانی بەندەکانی وە ئەیان بینێت ).

---

[1] (الإسراء:٥٢).



جێی شاهد ﴿وَسَبِّحْ بِحَمْدِهِ﴾ واتە: تسبیح کە پاك وبێگەردی خودایە مانا کانی (الحمد) بەگەورە دانانی خودای لەگەڵ بێ ئەمە لە قسە و گوفتاردا، هەمان مانای ﴿فَتَسْتَجِيبُونَ بِحَمْدِهِ﴾ واتە بە جێگەیاندنی فەرمانەکە ماناکانی (الحمد)ی لەگەڵ بێ ئەمە لە کار و کردەوەدا.

هەروەها چۆن وەکو (شرع ـ الحقیقة الشرعیة ـ ) ئەمە لە مرۆڤ داواکراوە وەکو (کون ـ الحقیقة الکونیة ـ) ئەمە لەسەر گشت مەخلوقێك سەپاوە: ﴿ يُسَبِّحُ الرَّعْدُ بِحَمْدِهِ ﴾[1] واتە: (بروسکە کاتێ پاك و بێگەردی بو خودا دەنوێنی ـ التسبیح ـ لە هەمان کات دا هەست بە گەورەیی خودا دەکات هەموو سیفەتەبەرزەکان دەداتە پاڵ خودا ـ الحمد ـ ). وە خودای گەورە لە باسی . مەخلوقاتی خۆی بە مرۆڤ ڕادەگەیەنێ کە (هیچ شتێك نییە پاك وبێگەردی بو خودا نەنوێنی وە لە کاروکردەوەی دا هەست بە گەورەیی خودا نەکات بەلام ئێوە ئەم تەسبیحاتە تێناگەن کە چونە) ﴿وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ وَلَٰكِن لَّا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ إِنَّهُ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا﴾[2] .

کە ئەم مانایەمان زانی زۆر بابەتی شرکی بچووکمان بو ڕووندەبنەوە، کە بە نمونە زیاتر ڕوونیان دەکەینەوە:

کاتێ فەرمانبەرێك لە ئەنجامدانی کارەکانی وا هەست بکات کە رزق و پاداشت لەدەست بەرێوەبەرەکەیەتی، بۆیە لە پێناو ڕازی کردنی ئەو سەرپێچی خودا دەکات لە کاری ڕۆژانەی دا، جێی تێڕوانینی سەرپێچییەکە ئەوە نییە کە تەنها سەرپێچییە، بەلکو جێی سەرنج و تێڕوانین هۆکارەکانی سەرپێچییەکەیە، نەك لە دەوروبەری فەرمانبەرەکە بەلکو لە ناخی فەرمانبەرەکە کە مەیلی دڵی بەلای ڕازیکردنی مەخلوق شۆڕبۆتەوە نەك بە لای خالق! کە ئەمە لە چەشنی (شرك)ە کە زانایانمان پێی ئەلێن شرکی بچوك.

---

(١) (الرعد:١٣).

(٢) (الاسراء: ٤٤).

وە هەروەها کاتێك فەرمانبەرێك ـ بۆ نموونە ـ کاتی بەجێگەیاندنی تەرك و فەرمانی ڕۆژانەی مێزان لای ئەو رازیبوونی خودا بێ، ئەو کات کاردکانی رۆژانەی ماناکانی (الحمد) دەگرنەخۆیان، وە (ڕۆتین)ی کاری ڕۆژانە دەبێتە (دین)، وە ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ﴾ بە کار ئەنجام دەدرێت، نەك تەنها بە دڵ ئەمەش مانای تەواوی خودا پەرستییە: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ﴾. وە ناوەڕووکی (توحیدە): ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ﴾ وە جوانی ئیمانە ﴿ادْخُلُوا الْجَنَّةَ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾[١].

## شەشەم:

### ڕیزبەندی (حمد) لە فاتیحەدا لە نێوان دوو (رەحمەت)دا گەشبینی بە موسلمان دەبەخشێ

هەر کردەوەیەك بۆ خودا بکەی دەبێ ماناکانی (الحمد)ی لەگەڵ بێ، تاوەکو بە خودا پەرستی بژمێردرێت وەکو باسمان کرد، وە شێوازی ڕیزبەندی (سیاق) فاتیحە وا پیشاندەدات کە باشترین (حمد) ئەوەیە کە هەستکردن بە ڕەحمەتی لەگەڵ بێ چونکە ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ﴾ لە فاتیحەدا لە نێوان دوو (رەحمەت) دایە: ﴿الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ی بەسمەلە ـ ئایەتی یەکەم ـ وە ﴿الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ ئایەتی سێیەمی فاتیحە.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە هەمووکات خوداپەرستی هیوا بە مرۆڤ ئەبەخشێ وە لە رەشبینی دووری دەخاتەوە و لە هەموو تەنگانەیەك رزگاری دەکات، هەر بۆیەش فەرمان بە نوح (علیه السلام) و هەڤاڵانی کرا کاتی کە سواربون لە کەشتی و ڕزگاربوون حەمدی خودا بکەن: ﴿فَإِذَا اسْتَوَيْتَ أَنتَ وَمَن مَّعَكَ عَلَى الْفُلْكِ فَقُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي نَجَّانَا مِنَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾[٢]. وە هەر لە بەر ئەمەش پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) رەشبینی بە هاوبەش دانان بۆ خودا(شرك) پێناسە دەکات کە دەفەرموێت: ((الطِّيَرة شرك))[٣].

---

(١) (النحل: ٣٢).

(٢) (المؤمنون: ٢٨).

(٣) رواه أبو داود و الترمذي وصححه. ينظر: فتح المجيد ص/٣٦١.



حەوتەم:

**سوپاسگوزاری بۆ خودا** (الحمد لله) بەرامبەر گەورەترین چاکەی **خودایە بۆ بەندە، بۆیە** گەورەترین بەندایەتییە بۆ خودا

سوپاسگوزاریکردنی خودا (الحمد) گەورەترین عیبادەتە کە بەندە بەرامبەر پەروەردگار دەکات، چونکە لە قورئاندا بەرامبەر گەورەترین نیعمەت هاتووە ئەویش ناسینی خودا بە ناوە بەرزەکانی و سیفەتە جوانەکانی، وەکو چۆن لە ڕێگای پێغەمبەرانەوە پێمان گەیشتوون.

پەروەردگار ئەم مانایە لە سوورەتی (الصافات ١٨٠ ـ ١٨٢) باس دەکات کە دەفەرموویت: ﴿سُبْحَٰنَ رَبِّكَ رَبِّ ٱلْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ ۝ وَسَلَٰمٌ عَلَى ٱلْمُرْسَلِينَ ۝ وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝﴾ واتە:

١ـ خودا خۆی بە پاکی و بێ بەرامبەری وەسف دەکات دوور لەو وەسفانەی کە موشریك و گاورەکان بۆ زاتی پیرۆزی ئەو دەکەن.

٢ـ خودا سڵاو لەو پێغەمبەرانە دەکات کە لە ڕێی ئەوانەوە خۆی بە بەندەکانی ناساندووە بە وەسفە جوان و پاکەکانی.

٣ـ لە پێناو ئەم چاکەیەی کە خودا بە بەندەکانی کردووە، کە نیعمەتی ناسینی خودایە بە سیفەتە بەرزەکانی، پێویستە ئەم بەندانە سوپاسگوزاری (حمد)ی ئەو خودایە بکەن، کە پەروەردگاری هەموو جیهانە[1] . وە چونکە پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) لە هەموو کەسێك زیاتر خودای ناسیوە بە ناو و سیفەتە جوانەکانییەوە، بۆیە لە هەموو کەس زیاتر (حمد)ی خوای کردووە، لە بەرئەوەش یەکێ لە ناوەکانی (أحمد)ە.

---

(١) ينظر: التدمرية ص٩٨ بشرح البراك و عناية السديس.



وە لەبەر ئەوەی کە لە هەموو پێغەمبەرەکان زیاتر ناو و سیفەتەکانی خودای وەسفی خودای بە مرۆڤایەتی گەیاندووە بۆیەناوی (محمد)ە. بەمانای جێی سوپاسی هەمیشە خوداپەرستێك کە لە ڕێی قورئان وە سوننەتی ئەوەوە خودای ناسیبێ بە ناو و سیفەتەجوانەکانی [1].

## هەشتەم:

### جوانی سوپاسگوزاری مرۆڤ بۆ خودا (الحمد لله)، لەجوانی هەڵسوکەوتی مرۆڤ دەردەکەوێ بەرامبەر خەڵك.

ئەگەر مرۆڤ بیەوێ بزانێت کە ئایا لە پلە و پایەی سوپاسگوزاری (حمد)ـدا دەژی بۆ خودای پەروەردگار یان نا؟. ئەوا با بڕوانێتە هەڵسوکەوتی خۆی بەرامبەر خەڵك چونکە خودای **پەروەردگار** لە وەسفی ئیمانداراندا دەفەرمووێت ﴿وَهُدُوٓاْ إِلَى ٱلطَّيِّبِ مِنَ ٱلْقَوْلِ وَهُدُوٓاْ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْحَمِيدِ﴾[2] ، واتە: (دووشتیان پێ بەخشراوە لە بەهەشتا: **یەکەمیان** گوفتاری شیرین، وە **دووەمیان** ڕێی ڕاستی ئەو خودایەی کە هەموو بوونەوەر سوپاسگوزاری(حمد) دەکەن، ئەمەش پاداشتێکە لە هەمان چەشنی کردەوەیان لە دونیا دا، کە گۆتن وگوفتاری شیرینە لە گەڵ خەڵك وە بەردەوامبوونە لە سەر ڕێگای ڕاست ﴿ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ﴾ = ﴿وَهُدُوٓاْ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْحَمِيدِ﴾ بە سوپاسی کردنێکی بەردەوام. وە پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) ئاماژە بەمە دەکات کاتێ دەفەرمووێت: ((إنما بعثت لأتمم صالح الأخلاق))[3] **واتە: (مەبەست لە هاتنی پەیامەکەم گەیاندنی خۆڕەوشتی جوانە بە ئەوپەڕی ڕێز و بەرزایی).**

---

(١) ينظر: أوجز المسالك إلى موطا مالك ١٧\٦٣٧ ـ ٦٣٩ و سبل الهدى والرشاد في سيرة خير العباد ٤٨٨/١ وما بعده.

(٢) (الحج:٢٤).

(٣) أخرجه أحمد ١٤\٥١٣ ط: المؤسسة.



## نۆیەم:

**نیشانەی جێگیربوونی ماناکانی (الحمد لله) لە دڵی مرۆڤدا . زمانێکی پاڕاوەیە بەرامبەر خودا، کە کڵکڵەی خواپەرستی و بەندایەتییە بۆ خودا.**

ئەگەر مانای ﴿ الحَمدُ لله ﴾ **مان زانی کە** بە گەورەدانانی خودایە لە دڵاندا، وە **هەست کردنە بە سیفەتە بەرزەکانی خودا، وەکو چۆن لە ڕێی پێغەمبەرانەوە پێمان گەیشتوون (شرعاً)**، وە گەورەی نهێنییەکانی بوونەوەر ئاماژەی بو دەکەن (کوناً)، ئەوا یەکەم دەرکەوتەی ئەنجامەکانی ئەم مانایانە لە دڵی مرۆڤدا پاڕانەوە و دوعا کردنی مرۆڤە لە خودا، هەربۆیەش ئایینی گشت پێغەمبەران (علیهم السلام): یەك خوداپەرستییە (التوحید): کە بریتییە لە پاڕانەوە لە خودا، وە دوورکەوتنەوەیە لە هاوبەش دانان بۆخودا (شرك): کە بریتییە لە پاڕانەوە لە بێجگە لە خودا.

قورئانی پیرۆز ئەم مانایە لە زۆربەی ئایەتەکانیدا دووبارە دەکاتەوە لەوانە: ﴿يُولِجُ ٱلَّيْلَ فِى ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِى ٱلَّيْلِ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِى لِأَجَلٍ مُّسَمًّى ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ لَهُ ٱلْمُلْكُ وَٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ مَا يَمْلِكُونَ مِن قِطْمِيرٍ ۝ إِن تَدْعُوهُمْ لَا يَسْمَعُوا۟ دُعَآءَكُمْ وَلَوْ سَمِعُوا۟ مَا ٱسْتَجَابُوا۟ لَكُمْ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَكْفُرُونَ بِشِرْكِكُمْ وَلَا يُنَبِّئُكَ مِثْلُ خَبِيرٍ﴾[1] واتە: (پەروەردگار لە باسی گەورەیی خۆی ئەفەرمووێت: هەر خودایە کە شەو تێهەلکێشی ڕۆژ دەکات وە ڕۆژ تێهەلکێشی شەو دەکات، ڕۆژ و مانگی ملکەچ کردوون کە هەر یەکەیان بۆ کاتی دیاریکراو ڕێگای خۆی دەبڕێت کە بۆی دیاری کراوە، ئا ئەمە ئەو خودایە کە پەروەردگارتانە، وە ئەو کەسانەی کە جگە لەو لە کەسانی دی دەپاڕێنەوە ئەمانە هاناو هاواریان بۆ کەسێك دەبەن کە توێکڵە تەنکەکەی دەوری ناوکی خورماشیان لە دەستدا نییە، وە کاتێ لێیان ئەپاڕێنەوە گوێبیستی نزاکانیان نین، وە ئەگەر گریمان وا دابنێین

---

(١) (الفاطر ١٣ ـ ١٤).

گوێبیستن، ئەوا هەرگیز وەڵامیان نادەنەوە، وە لە ڕۆژی قیامەت حاشادەکەن لەو شرکەی کە کردوویانە، کە دوعاکردنە لە بێجگە لە خودا، ئەمە ئاییینی یەك خودا پەرستییە، کە کەس وەکو خودا زانا نییە پێت ڕابگەیێنی، کەواتە دەستی پێوە بگرە)

نهێنییەکە لێرەدا ئەوەیە کە ئەوەی دوعا لە بێجگە لە خودا دەکات سوپاسگوزاری(حمد)ی کەسانێکی تری لە ناو دڵە کە لایان وایە ئەم کەسانە باڵادەستن، ئەگەر مردووش بن لە تەنگانە بە هانایان دێن کە ئەمەش (شرك)ە هاوبەشی دانانە بۆ خودا، وە دەرچوونە لە ئاییینی گشت پێغەمبەران (علیهم السلام ). وە نەك تەنها ئەمە (شرك)ە بەڵکو نەبوونی ماناکانی (الحمد) لە ناو دڵدا، کە وا لە مرۆڤ بکات دوعا لە خودای پەروەردگار نەکات وە لە بێجگە لە خودا نەکات، ئەوا هەر (شرك)ە ! چونکە خودا پەرستی بریتییە لە دوعا و نزاکردن لە خودا وە پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم) ئاماژە بۆ ئەم مانایە دەکات کاتێ دەفەرموویێت: [illegible] ))[1] واتە: (دوعاکردن خوداپەرستییە) وە لە ئایەتی ژمارە (٦٠)ی سوورەتی (الغافر) ئەم مانایە بە جوانی دەردەکەوێت: ﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدْعُونِىٓ أَسْتَجِبْ لَكُمْ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِى سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ﴾ واتە: (پەروەردگار دەفەرموویێت: ئەی خەڵکینە، دوعا و هاوار کردنتان بۆ من بهێنن وە لە من بپاڕێنەوە، ئەوا وەڵامی دوعاو نزاتان دەدەمەوە، وە داخوازیەکانتان پێدەبەخشم، وە ئەوانەی خۆیان بە گەورە دەزانن، لە پەرستنم - لێم ناپاڕێنەوە - بەسەرشۆڕی دەخرێنە ناو دۆزەخەوە)[2].

---

(١) أخرجه أحمد ٤\٢٧١ و أصحاب السنن.

(٢) ینظر: تفسیر ابن کثیر ٧\١٥٠-١٥٤.

بۆ زیاتر وردبونەوە لەجێی شاهد لە ئایەتەکەی سوورەتی غافر بەراورد بکە لە نێوان: ﴿ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ﴾ داوای دوعاکردنی تێدایە لە خودا، وە ﴿يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي﴾ دوعانەکردن لە خودا و پشت گوێخستنی بەنمایەتییە بو خودا !!.

وە هەمان شانا لە سوورەتی (مریم ٤٨ ـ٤٩): ﴿وَأَعْتَزِلُكُمْ وَمَا تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ وَأَدْعُوا رَبِّي عَسَىٰ أَلَّا أَكُونَ بِدُعَاءِ رَبِّي شَقِيًّا ۝ فَلَمَّا اعْتَزَلَهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ .. ﴾ جێی شاهد: بەراورد بکە لە نێوان: ﴿وَمَا تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ﴾ دوعاکردن لە بێجگە لە خودا، وە ﴿وَمَا يَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ﴾ پەرستنی بێجگە لە خودا!.

واتە: خودا پەرستی ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ بریتیە لە دوعاکردن لە خودا: ﴿اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ﴾. سەرچاوەی ئەمەش بو ماناکانی (الحمد) دەگەڕێتەوە کە دەروازەی خودا پەرستییە.

بۆیە پێویستە خوێنەری (الفاتحە) بزانێت کە ئەمە سوورەتێکە مرۆڤ فێری دوعاکردن و چۆنیەتی دوعاکردن و دووبارەکردنەوەی دوعاکردن دەکات. بەڵکو گشت ژیانی مرۆڤ دەکاتە تەنها یەك پەیوەندی لە نێوان مرۆڤ و خودا، کە دوعاکردنە، وەگشت لق و باڵی ئەم ژیانە بۆ ئەم پەیوەندییە دەگەڕێنێتەوە.

## دەیەم:

## گشت پاڕانەوەی پێغەمبەران (علیهم السلام) لە قورئانی پیرۆزدا بۆ ماناکانی فاتیحە دەگەڕێنەوە.

چونکە فاتیحە سوورەتی یەك خوداپەرستییە بە هەموو ماناکانی یەك خوداپەرستییەوە، وە بنچینەی یەك خودا پەرستی بۆ دوعا کردن لە خودا دەگەڕێتەوە، بۆیە دەبینین گشت پاڕانەوەی پێغەمبەران لە قورئانی پیرۆزدا بۆ ماناکانی فاتیحە دەگەڕێنەوە لەوانە:

* دوعای ئەیوب (علیە السلام): ﴿وَأَيُّوبَ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَسَّنِيَ ٱلضُّرُّ وَأَنتَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ﴾ واتە: (ئەیوب ـ علیە السلام ـ هاواری خودای کرد خودایە من ئازارم پێ گەیشتووە تۆش لە هەمووان بە سۆز و بەزەی تری) بنەمای ئەم دوعایە دەگەڕێتەوە بۆ: ﴿رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ و ﴿ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ و ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ لە فاتیحەدا وەکو لەم خشتەیەدا هاتووە:

| دوعای ئەیوب (علیە السلام) | ماناکان لە فاتیحەدا |
|---|---|
| ﴿وَأَيُّوبَ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ﴾<br>پاڕانەوەکە بە وەسف کردنی خودا بە پەروەردگاری دەست پێ دەکا. | ﴿رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾<br>پەروەردگاری جیهان |
| ﴿أَنِّي مَسَّنِيَ ٱلضُّرُّ﴾<br>دان نانە بە بێ دەسەڵاتی مرۆڤ بەرامبەر خودا پێویستی مرۆڤ بە خوداکەی، ئەمەش پەرستن و پشت بەستنی بەندەیە بە خودا. | ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾<br>هەموو پەرستنێکم تەنها بۆ خودایە وە هەروها هەموو پشت بەستنێکم تەنها بە خودایە. |
| ﴿وَأَنتَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ﴾<br>پاڕانەوەکە بە وەسف کردنی خودا بە ڕەحمەت کۆتایی پێ هێنراوە. | ﴿ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾<br>خاوەن ڕەحمەت و ڕەحمەت کار بە بەندەکانی. |

وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ

وە ئەم پەیوەندییە لە ناو دوعاکانی هەموو پێغەمبەران (علیهم السلام) هەست پێدەکەی، کە بە هیچ شێوەیێك نزاکانیان لە ماناکانی فاتیحە دەرناچن، بۆ زیاتر تێگەیشتن، لەم خشتەیە بڕوانە:

| پێغەمبەران | دوعاکەی لە قورئاندا | پەیوەندی دوعایەکەی بە ئایەتەکانی فاتیحەوە. | لێکدانەوە |
|---|---|---|---|
| إبراهیم (علیه السلام) | ﴿وَإِذۡ قَالَ إِبۡرَٰهِيمُ رَبِّ ٱجۡعَلۡ هَٰذَا ٱلۡبَلَدَ ءَامِنٗا وَٱجۡنُبۡنِي وَبَنِيَّ أَن نَّعۡبُدَ ٱلۡأَصۡنَامَ﴾ (إبراهیم: ٣٥) | ﴿رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ ﴿ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ﴾ | إبراهیم (علیه السلام) پارانەوەکەی بە سیفەتی (پەروەردگاری) ﴿رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ دەکات بۆ دوو داواکاری:<br>١ـ هەبوونی نارامی لە ولاتی مەککە.<br>٢ ـ پارێزراوی خۆی و نەوەکانی لە بت پەرستی.<br>ئەم دوو داواکاریەش بریتین لە مانای: ﴿ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ﴾. |
| یونس (علیه السلام) | ﴿وَذَا ٱلنُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَٰضِبٗا فَظَنَّ أَن لَّن نَّقۡدِرَ عَلَيۡهِ فَنَادَىٰ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ (الأنبیاء٨٧) | ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ ﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ﴾ | یونس (علیه السلام) لە تەنگانەترین شوێن بە هیوای رزگاربوون بوو، ئەمەش بڕوابوونە بە فراوانی رەحمەتی خودا: ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾.<br>وە دانی هێنا بە کەمتەرخەی خۆی بەرامبەر خودا، وە ستایشی خودای کرد بەوەی کە تەنها خۆی شایستەی پەرستنە. کە ئەمەش مانای : ﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ﴾ـە |
| زکریا (علیه السلام) | ﴿وَزَكَرِيَّآ إِذۡ نَادَىٰ رَبَّهُۥ رَبِّ لَا تَذَرۡنِي فَرۡدٗا وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلۡوَٰرِثِينَ﴾ | ﴿ مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ﴾ | زکریا (علیه السلام) بە مانایەکانی هەبوونی مولك بۆ پەروەردگار ﴿ مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ﴾لە خودا دەپاڕێتەوە تاوەکو نەوەی پێ ببەخشێ. |

ئەمانە وەکو نمونە خستمانە ڕوو، وە هەر دوعایێك لە قورئانی پیرۆزدا ببینی بنەماکانی بۆ ماناکانی فاتیحە دەگەڕێنەوە.

هەروەها هەمان شت سەبارەت بەو دوعایانەی کە پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) فێری هەڤاڵەکانی کردوون، بۆ نمونە ئەو دوعایەی کە پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) فێری (أبوبكر الصديق ـ رضي الله عنه ـ) دەکات تاوەکو لە نوێژەکەیدا بکات، ئەگەر لێی ورد ببینەوە بریتییە لە دووبارەبوونەوەی ماناکانی فاتیحە وەکو لەم خشتەیەدا بومان دەردەکەوێت:

| دەقی دوعایەکەی(أبو بكر ـ رضي الله عنه ـ) | ئایەتەکانی فاتیحە |
|---|---|
| اللهم إني ظلمت نفسي ظلماً كثيرا<br>(دان نان بە کەمتەرخەمی بەرامبەر گەورەیی خودا وە بەندایەتی بو خودا) | ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ﴾ |
| ولا يغفر الذنوب إلا أنت<br>(دان نان بە پشت بەستن بە خودا بو لێبوردن لە کەم تەرخەمی) | ﴿وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ |
| فاغفرلي مغفرةً من عندك<br>(داوای لێبوردن) | ﴿اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ﴾ |
| وارحمني إنك أنت الغفور الرحيم<br>(داوای ڕەحمەت و پاڕانەوە بەسیفەتی لێبوردەیی و ڕەحمەت) | ﴿الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ |

وە هەروەها دوعای (سید الإستغفار):

| دەقی دوعای (سید الإستغفار) | ئایەتەکانی فاتیحە |
|---|---|
| اللهم أنت ربي لا إله إلا أنت<br>(خودایە تۆ پەروەردگاری منی وە پەرستنم تەنها بۆ تۆیە) | ﴿رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾<br>﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ﴾ |
| خلقتني و أنا عبدك<br>(تۆ منت خەلق کردووە وە منیش بەندەی تۆم) | ﴿رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾<br>﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ﴾ |
| و أنا على عهدك و وعدك ما استطعت<br>(ئەوەندەی لە توانام دایە وەفادار دەبم لەسەر بەجێگەیاندنی فەرمانەکانت ). | ﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ﴾ |
| أعوذ بك من شر ما صنعت<br>(خۆم بە تۆ ئەپارێزم لە هەر تاوانێك کە ئەنجامم دابێ) | ﴿غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾ |
| و أبوءُ لك بنعمتك عليَّ<br>(وە دان دەنێم بەو هەموو چاکانەی کە لە گەڵ منت کردووە) | ﴿صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ﴾ |
| و أبوء بذنبي<br>(وە دان ئەنێم بەو هەموو سەرپێچییانەی کە کردوومە) | ﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ﴾ |
| فاغفرلي فإنه لا يغفر الذنوب إلا أنت<br>(لێم ببۆرە تەنها تۆ لە تاوان خۆش ئەبی و تاوان دائەپۆشی). | ﴿ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ﴾ |

وە گشت دوعایەکانی پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم)لە ماناکانی فاتیحە هەلقولاون، چونکە دوعاکردن لە خودا، یەك خودا پەرستییە، وە ناوەڕۆکی دوعا یەك خودا پەرستییە، وە پەیامی پێغەمبەرمان(صلى الله عليه وسلم) یەك خودا پەرستییە.

## پانزەهەم:

### فاتیحە موناجاتە لەنێوان مرۆڤ و خودای پەروەردگار

سوورەتی (فاتیحە) موناجات و نزایە لە نێوان مروڤی موسڵمان و خودای پەروەردگار. خودای پەروەردگار ئایەت بە ئایەت وەڵامی بەندەی دەداتەوە، هەروەك لە فەرموودەی قودسیدا هاتووە کە خودای پەروەردگار سوورەتی (فاتیحە) بە نوێژ ناو دەبات وە دەفەرمووێت:

((قسمتُ الصلاة بيني و بين عبدي نصفين، و لعبدي ما سأل، فإذا قال ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ قال الله: حمدني عبدي. و إذا قال: ﴿ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ قال الله: أثنى عليَّ عبدي، فإذا قال: ﴿مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ﴾ قال: مجدني عبدي، فإذا قال: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ قال: هذا بيني وبين عبدي و لعبدي ما سأل، فإذا قال: ﴿ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ۝ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾ قال هذا لعبدي و لعبدي ما سأل))[١].

واتە: پەروەردگار دەفەرمووێت نوێژم کردووتە دوو بەش لە نێوان خۆم و بەندەکەم، کاتێ بەندە سوپاسگوزاری (حمد)ی خودا دەکات وە دەفەرمووێت: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ پەروەردگار وەڵامی دەداتەوە دەفەرمووێت: (بەندەی من حەمدی منی کرد)، وە کاتێ بەندە وەسفی خودا دەکات بە بێ سنوری رەحمەت وە دەفەرمووێت: ﴿ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ **پەروەردگار** وەڵامی دەداتەوە و دەفەرمووێت: (بەندەی من مەدحی کردم)، **وە کاتێ بەندە باس لە سزاو** پاداشتی خودا دەکات **لەرۆژێك دا کە تەنها خودا مەلیکە**، دەفەرمووێت: ﴿مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ﴾ پەروەردگار لە وەڵامی دا دەفەرمووێت: (بەندەم وەسفی کردم بە گەورەیی و بێ بەرامبەری)،

---

(١) رواه مسلم ٣٩٥ و غيره.



وە کاتێ بەندە ملکەچی خۆی بۆ خودا باس دەکات کە تەنها پەرستنی بۆ خودایە وە پشت بەستنی بە خودایە، وە دەفەرمووێت: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾، پەروەردگار لە وەڵامیدا دەفەرمووێت: (ئەمە لە نێوان من و بەندەکەمە وە ئەوەی بەندەکەم بییەوێت پێی دەبەخشم)، وە کاتێ بەندە داوایەکەی ـ کە داوای ڕێگای زانین و کردەوەی چاکەیە وە دورکەوتنەوەیە لە ڕێگای زانینێکی بێ کردەوە یان کردەوەیێکی بێ زانین ـ دەفەرمووێت: ﴿اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ﴾ پەروەردگار لە وەڵامیدا دەفەرمووێت: (ئەمە بۆ بەندەکەمە وە ئەوەی بەندەکەم داوادەکات پێی دەبەخشم).

کاتێ مرۆڤ لە نوێژەکانیدا لەگەڵ ئەم ڕاستییە بژیت ئەو کاتە مرۆڤێکە لە سەر قورئان پەروەردە بووە ماناکانی (الحمد) وە سۆزی دوعاکردن لەگەڵ خوێنی تێکەڵ بووە، ئەمەش پلە بەرزەکانی یەك خوداپەرستییە، بۆیەش پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) لە کاتی ماندووبوونی بە نوێژ کردن ماندوبوونی ئەچواند، وە دەی فەرموو: ((قم يا بلال فأرحنا بالصلاة))[1] واتە: بلال بانگ بدە با بە نوێژ بحەسێینەوە.

الله أكبر

---

(١) أخرجه أبوداود و الطبراني و غيرهما ينظر مشكل الآثار ١٤\١٦٧.

## دوانزەهەم:

### فاتیحە وەڵامدانەوەیە بو دیانەکان کە لە پاڕانەوەکانیاندا ناوی بێجگە لە خودا دینن. وە پەنا بۆ بێجگە لە خودا دەبەن.

ئەو سێ سیفەتەی خودا:(پەروەردگاری، ڕەحمەت، موڵك) کە فاتیحە پێیان دەست پێدەکات، وە دەستپێکی دوعا و پاڕانەوەی موسڵمانانن، وەڵامێکن بو دیانەکان (النصاری)، کە دوعاکانیان دەست پێدەکەن بە ناوی باوك و کوڕ و روح القدس (باسم الأب و الإبن و الروح القدس ـ الأقانيم الثلاث ـ) وەهەرسێکیان بە خودا دەناسن!.

وە جێی گەواهیدەر(شاهد) لە وەڵامەکە: جیاوازی یەك خودا پەرستی موسڵمانانە کە ناسین و پەرستنی یەك خودایە بە ناو و سیفەتە جوانەکانی، دژ بە هاوبەشدانانی دیانەکان بۆ خودا ـ شرك ـ کاتێ سیفەتەکانی خالق و مەخلوق وەکو یەك لێ ئەکەن، مەخلوق وەکو خالق ئەپەرستن [١].

## سێزدەهەم:

### ماناکانی یەك خودا پەرستی لە فاتیحەدا تەبان لە گەڵ عەقل و ژیری مرۆڤ

هەروەك چۆن عەقڵ و ژیری هەموو مرۆڤێك شاهێدی ئەوە دەدات کە تەنها خودا شایستەی هەموو حەمدێکە ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ﴾ چونکە:

* خاوەن هەموو مولکە بە کات و شوێنەوە ﴿مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ﴾.

* وە خاوەن هەموو دەسەڵاتێکە لە هەڵسووڕاندنی ئەم مولکە ﴿رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾.

* وە خاوەن ڕەحمەتی بێ سنورە ﴿ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾.

---

(١) ينظر: تفسير ابن عاشور ١\١٤٩.

هەر هەمان عەقلّ و ژیری شاهێدی ئەوە دەدەن کە پێویستە هەموو پاڕانەوەیێك تەنها لەو خودایە بکرێ کە:

* مولّکی هەبێ تاوەکو ببەخشێ .

* دەسەلاّتی هەبێ لە سەر مولّکەکەی تاوەکو بتوانێ ببەخشێ .

* ڕەحمەتی هەبێ تاوەکو بییەوێ ببەخشێ.

وە بێجگە لە خودای پەروەردگار کێ خاوەنی تەواوی مولّك و بالاّیی دەسەلاّت و بێ سنوری ڕەحمەتە ؟.

کەواتە بێگۆمان ئەوانەی دوعا لە بێجگە لە خودا دەکەن سەرەڕای ئەوەی تووشی (شرك) هاوبەش دانان بو خودا بوون، نەفام و گەمژەن وە هەرگیز ژیر و عاقل نین.

## چواردەهەم:

### تێگەیشتنی فاتیحە بە شاهیدی (عەقل) و (فیترەت) و (شەرع) چارەسەرییە بۆ گەورەترین تاوان کە مرۆڤ ئەنجامی دەدات کە خۆ بەگەورە زانینە (التکبر).

فاتیحە سوورەتی دوعاکردن و پاڕانەوەیە لە خودا، کە کاکلّەی یەك خودا پەرستییە، بۆیە دوعاکردن لە بێجگە لە خودا گەورەترین تاوانە کە مرۆڤ ئەنجامی دەدات، چونکە دژە بۆ یەك خوداپەرستی، لە هەمان کاتدا دژە بە (عەقل)، وە دژە بە (فیترەت)، وە دژە بە گشت دەقەکانی شەریعەت.

هەر لە بەر ئەمەش تاکە چارەی ئەم تاوانە تێگەیشتنی فاتیحەیە، کە گەڕانەوەیە بۆ جوانی بیرکردنەوە، وە پابەندبوونە بە دەقەکانی شەرع وە ئەنجامەکەشی حەسانەوەی دەروونە. ئەمەش زیاتر بۆمان ڕوون دەبێتەوە کاتێ لە قورئانی پیرۆز ورد ئەبینەوە و دەبینین کە خودای پەروەردگار دوعا کردن لە بێجگە لە خودا بە خۆبەگەورەزانین (تکبر) وەسف دەکات.



**کە هۆی هەرە گەورەی چۆنە ناو دۆزەخ و مانەوەیە لە دۆزەخ دا، هەروەکو لە سێ سوورەتی (النحل، الزمر، الغافر) ئەم مانایە دووبارە دەبێتەوە:**

* یەکەم سوورەتی (النحل) **ئایەتی(٢٩):** ﴿فَٱدۡخُلُوٓاْ أَبۡوَٰبَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَاۖ فَلَبِئۡسَ مَثۡوَى ٱلۡمُتَكَبِّرِينَ﴾ **واتە: (بچۆن بەرەو دەرگاكانی دۆزەخ، بۆ هەتا هەتایە لە ناویدا بمێننەوە، ئەمە بۆ خەڵكانی لووت بەرز و موتەكەبر خراپترین جێگایە)، کە لە سیاقی ئایەتی ژمارە (٢٠)ی هەمان سوورەت هاتووە** ﴿وَٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَا يَخۡلُقُونَ شَيۡـٔٗا وَهُمۡ يُخۡلَقُونَ﴾، **واتە: (ئەوانە دوعا لە بێجگە لە خودا دەكەن، ئەمانە دوعا لە كەسانێك دەكەن کە ناتوانن لە نەبوونەوە شتێك خەلق بكەن بەڵكو خۆیان مەخلوقن).**

**کەواتە با دوعاکار بێجگە لە خودا، ژیر بێ (عەقل)، بەجوانی بیركردنەوە بۆ یەك خودا پەرستی بگەڕێتەوە، چونكە ئەوانەی پەنایان بۆ دەبات بێجكە لە خودا هیچیان بە دەست نییە.**

* دووەم سوورەتی (الزمر) **ئایەتی(٧٢):** ﴿قِيلَ ٱدۡخُلُوٓاْ أَبۡوَٰبَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَاۖ فَبِئۡسَ مَثۡوَى ٱلۡمُتَكَبِّرِينَ﴾ **لەسیاقی ئایەتی ژمارە (٤٩)ی هەمان سوورەت هاتووە:** ﴿فَإِذَا مَسَّ ٱلۡإِنسَٰنَ ضُرّٞ دَعَانَا ثُمَّ إِذَا خَوَّلۡنَٰهُ نِعۡمَةٗ مِّنَّا قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلۡمِۭۚ﴾ **واتە: (لە تەنگانەدا مرۆڤی بێ باوەڕ هەواری خودا دەكات، وە كاتێ خودا لە تەنگانە ڕزگاری دەكات، و چاكە و خۆشی پێ دە بەخشێت، بەرامبەر ئەم چاكەیە لە خۆشی و بەرفرەوانیدا خودا لە بیر دەكات، وە وا پیشان دەدات کە خۆی ئەم چاكە و خۆشییەی بە خۆی بەخشیوە !).**

**کەواتە با دوعاکار بۆ (فیترەتی) خۆی بگەڕێتەوە لە كاتی بەرفرەوانی، هەروەكو چۆن لە تەنگانە بۆی دەگەڕایەوە، وە تەنها پەنای بۆ خودا دەبرد.**

* سێیەم سوورەتی (الغافر) **ئایەتی (٧٦):** ﴿ٱدۡخُلُوٓاْ أَبۡوَٰبَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَاۖ فَبِئۡسَ مَثۡوَى ٱلۡمُتَكَبِّرِينَ﴾ **لە سیاقی دوو ئایەتی ژمارە (٧٣-٧٤)ی هەمان سوورەت هاتووە** ﴿ثُمَّ قِيلَ لَهُمۡ أَيۡنَ مَا كُنتُمۡ تُشۡرِكُونَ ۝ مِن دُونِ ٱللَّهِۖ قَالُواْ ضَلُّواْ عَنَّا بَل لَّمۡ نَكُن نَّدۡعُواْ مِن قَبۡلُ شَيۡـٔٗاۚ كَذَٰلِكَ

يَضِلُّ ٱللَّهُ ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ واتە: (وەكو سزا بە خەسارەت مەندانی دۆزەخ دەگوترێت: كوا ئەوانەی لە دونیادا هاوارتان بۆ دەكرد پەناتان بۆ دەبردن بێجگە لە خودا، كاتێ (شرك)تان ئەنجام دەدا !؟. دۆزەخییەكانیش لە وەلآمدا دان بەوە دەنێن كە ئەوانەی لە دونیادا پەنایان بۆ دەبردن و هەواریان بۆ دەكردن تاوەكو بە هانایان بێن هیچیان وانەبوو، وە دەڵێن: ئەمڕۆ هەموویان لێمان وونبوون و سوودیان نەبوو بۆ ئێمە).

كەواتە با دوعاكار بێجگە لە خودا، بۆ دەقەكانی قورئانی پیرۆز فەرموودەكانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بگەڕێتەوە(**شەرع**)، كە گشتیان فەرمان بەوەدەكەن كە پاڕانەوە دوعاكردن لە خودا خوداپەرستییە، وە پاڕانەوە و دوعاكردن لە بێجگە لە خودا خۆ بەگەورەزانین و هاوبەشی دانانە بۆ خودا، و چارەنووسەكەشی دۆزەخە ـ خودا بمان پارێزێت ـ. كەواتە لە سیاقی ئایەتەكانی هەر سێ سوورەتەكە بە میزانی (**عەقل**) و (**فیترەت**) و (**شەرع**)، پەروەردگار دوعاكردن لە بێجگە لە خودا بە خۆبەگەورەزانین (تەكەبر) دەژمێرێت، كە دژە بۆ یەك خوداپەرستی، وە پێچەوانەی ناوەڕۆكی فاتیحەیە كە كاكڵەی یەك خوداپەرستییە.



## پازدەهەم:

### ڕێزبەندی ئایەتەکانی فاتیحە، مرۆڤ فێری ئەدەبی دوعاکردن دەکات

ئەدەبی دوعاکردن لە ڕێزبەندی یەك بە دوای یەکی ئایەتەکانی سوورەتی فاتیحە وەردەگیرێت ئەمەش بە چوار قۆناغ:

قۆناغی یەکەم: مەدح کردنی پەروەردگار: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾

قۆناغی دووەم: دان نانی کەسی دوعا خواز لە خودا بە بەندایەتیەکەی بو خودا: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾

قۆناغی سێیەم: داواکردن: ﴿ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ﴾

قۆناغی چوارەم: درێژە پێدان بە باسکردنی داواکراو ﴿صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾.

وە دەتوانین بڵێین قۆناغی پێنجەم زۆر دووبارەکردنەوەی دوعایەکەیە، ئەمەش لە زۆر دوبارەکردنەوەی فاتیحە وەردەگیرێت لە ژیانی ڕۆژانەی مرۆڤی موسڵمان.

وە ئەگەر ﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بە ئایەتێکی فاتیحە بژمێرین، هەروەك زۆر لە زانایان لە سەر ئەم ڕایەن، ئەوا هەست کردن بەوەی کە تەنها خودا تەوفیق دەدات بۆ دوعاکردن قۆناغی یەکەمی دوعایە، چونکە پیتی (ب) لە بەسمەلە بریتییە لە پیتی (باء)ی پشت بەستن (باء الإستعانة)[1].

بەڵام لێرەدا مەبەستمان قۆناغەکانی ناوەڕۆکی دوعا کردنەکەیە، کە تێپەڕینی دوعاکارە، بەم چوارقۆناغەی کە باس کران.

**وە ئەوەی لێرە گرنگە کە دوعاکار بزانێ ئەوەیە کە ڕێزبەندی ئایەتەکانی فاتیحە گەورەترین هۆی قەبووڵ بوونی دوعایە. وە قۆناغی پشت بەستن بە خودا بۆ دوعاکردن لە خودا لە پێش ئەمە دێت، کە تەوفیقی خودایە بۆ مرۆڤ کە دوعا لە خودابکات.**

---

(١) ينظر: تفسير النهر المارد بحاشية البحر المحيط ١\١٤.



## شانزەهەم:

**دوو بەشەکەی موناجات لە فاتیحەدا: (غیاب) وە (خطاب) ئاماژەیە کە دوعاکار پێویستی بە ئامادەباشی دەروونی هەیە بۆ دوعاکردن پێش دوعاکردن.**

**فاتیحە لە ڕووی شێوازی موناجاتەوە دوو بەشە:**

* بەشی یەکەمی فاتیحە: ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ - مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ﴾ **مەدح کردنی پەروەردگار بە ناوە پاکەکانی وە سیفەتە جوانەکانی. ئەمەش بەشێوەی باسکردن هاتووە لە (غائب)، چونکە مەبەست دەرچوونە لە غەفلەت، وە نزیکبوونەوەیە لە پەروەردگار، وەکو ئامادەباشی دڵ بو دوعاکردن.**

* بەشی دووەمی فاتیحە: ﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾ **بەشی (خطاب)ە، واتە گوتارە بۆ بەرامبەر، بە داننان بەبەندایەتی، وە داواکاری بەردەوام بوون لە سەر ڕێگای بەندایەتی.**

**چونکە بە هۆی بەشی یەکەمەوە دڵ لە غەفلەت ڕزگاری بووە، وە لە پەروەردگار نزیك بۆتەوە بە مەدح کردنی، وە گەیشتووتە باری ئارامی و ئامادەباشی بۆ دوعاکردن، بویە شێوازی موناجات لە (غیاب ـ بەشی یەکەم ـ)ەوە کە مەدح کردنی پەروەردگارە** ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ﴾ **دەگۆڕدرێت بۆ (خطاب ـ بەشی دووەم ـ) کە داننانە بە بەندایەتی مروڤ بو خودا، وە دوعاکردن و پاڕانەوە لە خودا** ﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾، **وەکو قۆناغی کاری دڵ بە دوعاکردن و پاڕانەوە لە پەروەردگار، لە کاتی نزیکبونی لە پەروەردگار، وە لە باری هەستکردنی دڵ بە گەورەیی پەروەردگار.**

**ئەمەش یەکێکە لە ئادابی دوعاکردن، وە هۆکارێکی گەورەیە بۆ قەبوولبوونی دوعا، پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم) ئاماژە بۆی دەکات کە دەفەرمووێت:** ((اعلموا أن الله

لا يستجيب دعاء من قلب غافل لاه))[1] واته: بزانن كه خودا دوعا له دڵێكی غافل قەبوڵ ناكات، واته دڵ پێویستی به ئامادەباشییه بۆ دوعاكردن - پێش دوعاكردن - به مەدح كردنی پەروەردگار [2].

## حەڤدەهەم:

### فاتیحه مرۆڤ فێری (توسل)ی شەرعی دەكات له دوعاكردندا.

(تەوەسل - خاتر- )ی شەرعی كه دوو شێوەیه، ناوەڕۆكی سوورەتی فاتیحه ئاماژەی بۆ كردووه:

* شێوەی یەكەم: (التوسل بالعمل الصالح) واته: مرۆڤ له خودا بپاڕێتەوه بەو كردەوه چاكانەی كه بۆ خودا كردوونی، ئەمەش بەم شێوەیه له فاتیحەدا خۆی دەنوێنێ:

(خودایه چونكه ئێمه تەنها سوپاسگوزاری(حمد)ی تۆ دەكەین ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾، وه چونكه تەنها تۆ ئەپەرستین ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ﴾، وه چونكه تەنها پشت به تۆ دەبەستین ﴿إِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾، لەبەر ئەم هەموو كردەوانه كه له ڕێگای تۆدا دەكەین: ڕێنماییمان بكه بۆ ڕێگای ڕاست ﴿ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ﴾ ڕێگای ئەوانەی زانستی بەسوود و كردەوەی چاكەت پێ بەخشیون ﴿صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ﴾، وه دوورمان بخه له ڕێگای ئەوانەی چاكه دەزانن، وه كردەوەی چاكه ناكەن كه لێیان توورەی ﴿غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ﴾، یان بەبێ زانست خوداپەرستی دەكەن كه گومڕاون ﴿وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾ ).

* شێوەی دووەم: (التوسل بأسماء الله وصفاته ) واته: تەوەسول به ناوه جوانەكانی خودلو سیفەته پاكەكانی، كه بەم شێوەیه له فاتیحەدا خۆی دەنوێنێ:

---

(١) رواه الترمذي ٥\٣٩٤ رقم: ٣٤٧٩.

(٢) ينظر: التسهيل لعلوم التنزيل ص٣٣-٣٤.

(خودایە بۆ خاتری ئەوەی کە تۆ پەروەردگاری جیهانی ﴿رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾، وە خاوەن رەحمەتی ﴿ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾، وە پاداشت و سزا لە رۆژی دوایدا تەنها بەدەست تۆوە ﴿مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ﴾، لە بەر خاتری ئەوەی ئەم هەموو سیفەتە پاك و بەرزانەت هەیە بۆ رێگای راست رێنماییمان بکە ﴿ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ﴾...).

**هەژدەهەم:**

**ئاماژەی فاتیحە بۆ تەبایی موسڵمانان وەکو یەك جەستە لە گشت کار و هەڵسوکەوتێکدا، رێنماییە بۆ کاری بەکۆمەڵ، وە هۆکارە بۆ قەبووڵ بوونی دوعا.**

لە دوعاکردن و نزای فاتیحەدا ئاماژە بەوە دەکرێت کە موسڵمانان هەموویان وەکو یەك جەستەن، موسڵمان لە دوعاکەیدا دەفەرمووێت ﴿ٱهْدِنَا﴾ واتە: رێنماییمان بکە، وە نافەرمووێت (إهدني): رێنمایم بکە، ئەمەش خۆی لەخۆیدا هاندانی موسڵمانانە بۆ تەبایی ونەبوونی دووبەرەکی و رق و کینە لە نێوانیاندا، چونکە هەر موسڵمانێك دوعای رێنمایی بۆ هەموو موسڵمانێك دەکات، لە هەر رۆژێکدا حەڤدە جار یان زیاتر.

وە هەروەها ئەم دارِشتە گشتگیرەی دوعا ئاماژەیەکە بۆ کاری بە کۆمەڵ، وە نوێژی بە جەماعەت.

وە هەروەها هۆکارێکە لە هۆکارەکانی قەبوولبوونی دوعا چونکە لە داب و نەریتدا ئەگەر مەلیکێك لەمەجلسەکەیدا بەکەسێکی بەخشی بەهەمووان دەبەخشێ، ئەی ئەگەر دوعاکارەکان یەك خودا پەرست (موحد) و ئیماندار بن، وە مەلیکەکە خودای پەروەردگار بێت !؟.

## نۆزدەهەم:

### تێگەیشتنی مانای فاتیحە پارێزگاری و شیفایە بۆ مرۆڤ

ئەگەر مانا بەرزەکانی (الحمد) لە فاتیحەدا تێگەیشتین، وە زانیمان گەورەترین بەرهەمەکەی دوعاکردنە لە پەروەردگار، ئەوا ئەوکات بۆمان دەردەکەوێت کە سوورەتی فاتیحە پارێزەر و شیفایە بۆ مرۆڤ، چونکە گشت نەخۆشییێك کە تووشی مرۆڤ دەبێ، پەیوەندی بە باری دەروونی مرۆڤەوە هەیە، وە کاتێ مرۆڤ لەگەڵ ماناکانی فاتیحە دەژیت ئەوا لەوپەڕی باری تەندروستی دەروونی دایە، بۆیە لەشێکی تەندروستی دەبێ.

## بیستەم:

### پوختەی چارەسەری فاتیحە بۆ نەخوشییەکانی دڵ و دەروون لە خشتەیەکدا.

چارەسەری فاتیحە بۆ نەخۆشییەکانی دەروون، بەکورتی لەم خشتەیەدا بۆمان ڕوون دەبێتەوە:

| نەخۆشی | چارەسەری | چۆنیەتی بەکارهێنان |
|---|---|---|
| خۆبەگەورە زانین (الكِبر) | ﴿ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴾ | ئەگەر زانیت سەرچاوەی هێز و توانات خودایە، ئەوا بزانە تۆ بێ هێزی لوتت بەرز مەکە. |
| ریبا (الرياء) | ﴿ إِيَّاكَ نَعْبُدُ ﴾ | ئەگەر زانیت بەندەی خودای، وە تەنها کڕنۆش بۆ خودا دەبەی، ئەوا با هەموو خزمەتێکت بۆ ڕەزامەندی خودا بێ نەك سوپاسی خەڵك. |
| حەسەد (الحسد) | ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ | ئەگەر زانیت ئەو خودایەی کە ئەی پەرستی پەروەدگاری هەموو جیهانە، ئەوا ستایشی بکە وە ڕەخنەی لێ مەگرە، کەبۆچی بە فلانی بەخشیوە! |
| بێزاری (اليأس من رحمة الله) | ﴿ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ | ئەگەر زانیت خودایێکت هەیە خۆی بە ڕەحمەت وەسف دەکات با هەموو دونیا لە دەستت بڕوا، ئەو دەرگاکانت بۆ دەکاتەوە، با دڵت بەو شادبێ. |

| نەخۆشی | چارسەری | چۆنیەتی بەکارهێنان |
| --- | --- | --- |
| نەترسان لە خودا (الأمن من مکر الله) | ﴿ مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ﴾ | ئەگەر زانیت ئەو خودایەی کە ئەی پەرستی سزای ستەم کار دەدات، وە پاداشتی چاکە کار دەدات، ئەوا سەرپێچی ئەو مەکە چونکە ستەمە وە سزای لە پاڵە. |
| بێ کەسی و گۆشە گیری (الإنعزال) | ﴿ ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ ﴾ | ئە گەر زانیت خودایەکت هەیە حەز دەکات لێی بپاڕێیەوە، وە وەڵامت دەداتەوە، ئەوا هەرگیز بە تەنها نیت! وە ئەگەر زانیت لەگەڵ کاروانی خودا پەرستانی، ئەوابزانە هەرگیز بە تەنها نیت، وە لە نیعمەتا ئەژیت. |
| سەر شۆڕی (الذل) | ﴿ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ﴾ | ئەگەر زانیت نیعمەتی دونیا وقیامەت سەربەرزییە، ئەوا (زانست) و (کردار) کۆبکەرەوە، وە بزانە (زانست)ی بێ (کردار) سەر شۆڕییە بە تۆڕەیی خودا، وە (کردار)ی بێ (زانست) سەر شۆڕییە بە گومڕابوون. |

ئەم نەخۆشییانەی باسمان کردن دەیان نەخۆشی تر کە بەتایبەت پاش پێشکەوتنی تەکنەلۆجیا سەریان هەڵدا گشتیان خۆڵەمێشی تاوانی (شرك)یان لەسەرە، وە چارەسەریان تەنها ماناکانی سوورەتی فاتیحەیە، کە پوختەی گشت پەیامە ئاسمانییەکانە.

بۆ نمونە:

❋ مرۆڤی خۆبەگەورەزان (مُتَكَبِرْ) خۆ پەرستە.

❋ وە مرۆڤی ڕییایی خەڵك پەرستە.

❋ وە مرۆڤی حەسود دونیا پەرستە، بە هەواو هەوەسی خۆی ڕەخنە لە خودا دەگرێت.

❋ وە مرۆڤی بێزار و هەستکار بە بێکەسی، لە بەر کەم عەقلی خۆی بۆتە عەقل پەرست، گۆمانی خراپ بە خودا دەبات.

* وە مرۆڤی لەخودا نەترس، هەواوهەوەسی خۆی ئەپەرستیٚ، بەپێی حەز و ئارەزووەکانی بیردەکاتەوە. ...هتد

ئیتر هەر نەخوشییەکی دڵ و دەروون ـ کە گەورەترین بنەمای نەخۆشییەکانی جەستەن ـ کاتیٚ موسڵمان بیری لێدەکاتەوە دەزانیٚ پەیوەندی بە بیروباوەڕەوە هەیە، وە چارەسەریەکەی تەنها یەك خودا پەرستییە (التوحید)، کە پەیامی گشت پێغەمبەرانە (علیهم السلام) وە سوورەتی فاتیحە گشت ماناکانی ئەم پەیامە لە خۆ دەگرێت، بۆیە تێگەیشتنی تاکە چارەسەرییە بۆ هەموو نەخوشییەك.



## بیست و یەك:

## سوورەتی فاتیحە و سوورەتی( الناس ) خۆشك و بران لە پاراستنی مرۆڤ لە گشت نەخوشییەك

هەر وەك چون فاتیحە چارەسەرە بۆ مرۆڤ لە گشت نەخۆشییەك لە جەستە یان لە دەروون، لەهەمان کاتدا پارێزەریشە لە گشت نەخۆشییەك لە جەستە یان لە دەروون، بۆیە دەبینین لێکچوونێکی زۆرهەیە لە نێوان سوورەتی فاتیحە ـ کە یەکەم سوورەتە لە موسحەفدا ـ وە سوورەتی (الناس) ـ کە دوا سوورەتە لە موسحەفدا ـ وەك لەم خشتەیەدا دەردەکەوێت:



| سوورەتی فاتیحە | سوورەتی (الناس) |
| --- | --- |
| ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ تەنها (حمد)ی خودا دەکەین، چونکە خودا سیفەتی پەروەردگاری هەیە بەسەر هەموو جیهانان. | ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ﴾ تەنها خۆمان بە خودا پەروەردگار دەپارێزین، چونکە سیفەتی پەروەردگاری هەیە بەسەر هەموو خەڵکان. |
| ﴿مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ﴾ ئەم پەروەردگارە لە ڕۆژی سزا و پاداشتدا هەموو کارێکی بەدەستە. | ﴿مَلِكِ ٱلنَّاسِ﴾ ئەم پەروەردگارە هەموو خەلکێکی بەدەستە. |
| ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ تەنها ئەو دەپەرستین وە پشتی پێ دەبەستین. | ﴿إِلَٰهِ ٱلنَّاسِ﴾ ئەو پەرستراوی هەموو خەلکێکە. |
| ﴿ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ﴾ داوای وەدەست خستنی ڕێگای ڕاستی لێدەکەین. | ﴿مِن شَرِّ ٱلْوَسْوَاسِ ٱلْخَنَّاسِ﴾ بۆ دوور کەوتن لە ڕێگای چەوت خۆمان بە ئەو دەپارێزین. |
| ﴿صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾ ڕێگای ڕاست ڕێگای (زانست) و (کردار)ە کە چاکەی خودایە بە موسڵمانان، وە (زانست)ی بێ (کردار) جێی تووڕەیی ئەوە لە سەر جوولەکە، وە (کردار)بێ (زانست) جێی گومراوبوونی دیانەکانە. | ﴿مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ﴾ خۆمان بە ئەو دەپارێزین لە ڕێگای چەوت و شەڕانگێزی کە لە مرۆڤ و جنوکەوە دێت، کە ڕێگای (کردار)ی بێ (زانست)ە، یان ڕێگای (زانست)ی بێ(کردار)ە. |





کاتیٚ هەست بەم لیٚکچونە دەکەین باشتر لە فەرمودەکانی پیٚغەمبەرمان تیٚدەگەین.
کە لە مەدحی سوورەتی فاتیحەدا دەفەرمووێت: ((وما يدريك أنها رقية !؟))[1] واتە: چۆن زانیت خوێندنەوەی فاتیحە بەسەر نەخۆش چارەسەرییە بۆ نەخۆشەکە، وەکو ڕازیبونێك لە کردەوەی ئەو کەسانەی ئەم کارەیان ئەنجام داوە. وە دەفەرمووێت: ((أفضل الدعاء: الحمد لله))[2] واتە: باشترین پاڕانەوە (الحمد لله)یە، چونکە هەر پاڕانەوەیەکی شەرعی کە مرۆڤ لە خودای پەروەردگار دەکات، بۆ دوو داواکاری دەگەڕێتەوە:

* یەکەم: داوای لادانی خراپەیەکە لە سەر مرۆڤ لە کاتی پاڕانەوەکە.

* دووەم: داوای ڕێگرتنە لە خراپەیەك بۆ سەر مرۆڤ لە داهاتوو.

یەکەمیان چارەسەرییە وە دووەمیان پاراستنە، ئەمانەش ماناکانی سوورەتی فاتیحەن ـ وەکو باس کرا ـ سوورەتەکەش بە (الحمد لله) دەست پیٚدەکات، کە ناوەڕوکەکەی تەنها ماناکانی خوداپەرستی سوپاسگوزاری خودایە. وە لە مەدحی سوورەتی (الناس)وە (الفلق)دا پیٚغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) دە فەرموویت: ((ما سأل سائل بمثلهما، ولا استعاذ مستعيذ بمثلهما))[3] واتە: هیچ دوعاکارێك دوعای نەکردووە کە بەقەد دوعاکردن باش بیٚ بەم دوو سوورەتە (الناس، الفلق)، وە هیچ پەناخوازێك پەنای بۆ خودا نەبردووە بە شتێك کە لەم دوو سوورەتە باشتر بیٚ. کەواتە نزیکترین ڕێگا بۆ چارەسەری لە هەر نەخۆشییەك کە مرۆڤ تیادا دەژی، یان پاراستن لە هەر تەنگانەیەك کە مرۆڤ هەستی پیٚ بکا لە داهاتوو، لە یەکەم لاپەڕە و دوا لاپەڕەی قورئانی پیرۆزدا دەبینێتەوە.

---

(١) متفق عليه.

(٢) رواه الترمذي ٣٣٨٣.

(٣) رواه النسائي٨\٦٤٢.

## بیست و دوو:

### سوپاسگوزاری بەردەوام بۆ خودا ڕێگای گەیشتنە بە پایەی بڕوابوون بە قەدەر، کە بەهێزترین خاڵی حەسانەوەی دەروونی مرۆڤی موسڵمانە.

کاتێ بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە فاتیحە چارەسەرە بۆ ئازاری جەستەیی و نائارامی دەروونی، واتە نەمانی ئازار، دەبینین کە لەباسی شایستەی سوپاسگوزاری(حمد) بۆ خودا، پەروەردگار ئاماژە بە ماناکانی نەمانی ئازاردەکات لە چەندین ئایەتدا لەوانە:

* لەسوورەتی (المؤمنون:٢٨): ﴿فَقُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى نَجَّىٰنَا مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ واتە: سوپاسگوزاری(حمد) بۆ خودا کە لە ستەمکاران ڕزگاری کردین، وە لە ژێر دەستییا نائومێدی نەکردووین.

* لە سوورەتی (فاطر:٣٤): ﴿وَقَالُوا۟ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِىٓ أَذْهَبَ عَنَّا ٱلْحَزَنَ﴾ واتە سوپاسگوزاری(حمد)بۆ خودا کە خەمۆکی لایدا لەسەرمان، وە بە ئیمان و ئیسلام دڵی خۆش کردین.

* لە سوورەتی (الأعراف:٤٣): ﴿وَقَالُوا۟ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى هَدَىٰنَا لِهَٰذَا﴾ واتە: سوپاسگوزاری(حمد)بۆ خودا کە ڕێنماییکردین بۆ ئیسلام کە ڕێگای بەختەوەرییە.

* لە سوورەتی (إبراهیم:٣٩): ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى وَهَبَ لِى عَلَى ٱلْكِبَرِ إِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ ۚ إِنَّ رَبِّى لَسَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ﴾ واتە: سوپاسگوزاری(حمد)بۆ خودا کە پاش پیری ئیسماعیل و ئیسحاقی پێ بەخشیم، وە منی پاراست لە وەچاخ کوێری، پەروەردگارم گوێبیستی دوعایە.

پوختەی مانای ئەمە ئەوەدەگەیێنی کە ژیان بۆ خودا، وە لەگەڵ خودا ژیانێکی تەندروستە، ئەویش هەستکردنە بەوەی کە هەبوونی هەموو چاکەیەك لە ژیانی مرۆڤ دا لە پەروەردگارەوەیە، وە لادانی هەموو خراپەیەك لە ژیانی مرۆڤدا لە پەروەردگارەوەیە ئەمەش پایەی ئیمانە بە قەدەر!. کە مرۆڤ هاندەدات بۆ ئەوەی هەموو چرکەیەکی ژیانی سۆپاسگۆزاری بێت بۆ خودا.

## بیست و سێ:

### پایەی بڕوابوون بە قەدەر لە نێوان ڕۆژی قیامەت و شەوی قەدر دا!

ئایەتی ﴿ مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ﴾ لە فاتیحەدا، وە لەبەرامبەریدا ئایەتی ﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةٖ مُّبَٰرَكَةٍۚ إِنَّا كُنَّا مُنذِرِينَ ۝ فِيهَا يُفۡرَقُ كُلُّ أَمۡرٍ حَكِيمٍ﴾ لە سوورەتی دوخان دا. پەیوەندییەکی سەرنج ڕاکێش لەنێوانیاندا هەیە وەك لەم خشتەیەدا دیارە:

| ﴿مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ﴾ (یوم الجمع) | ﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةٖ مُّبَٰرَكَةٍۚ﴾ (لیلة الفرق) |
| --- | --- |
| (یوم الدین) بریتییە لە (یوم الجمع) واتە: ڕۆژی کۆکردنەوەی خەڵك بۆ حیساب، وە کۆکردنەوەی کردەوەی تاکەکەس بۆ حیساب. | (لیله القدر) بریتییە لە (لیله الفرق) واتە: شەوی بڵاوکردنەوەی کار و ڕزق وە ئەجەل بەسەر کەساندا تا ساڵی دواتر لە هەمان شەو. |
| ﴿وَكَذَٰلِكَ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ قُرۡءَانًا عَرَبِيّٗا لِّتُنذِرَ أُمَّ ٱلۡقُرَىٰ وَمَنۡ حَوۡلَهَا وَتُنذِرَ يَوۡمَ ٱلۡجَمۡعِ لَا رَيۡبَ فِيهِۚ فَرِيقٞ فِي ٱلۡجَنَّةِ وَفَرِيقٞ فِي ٱلسَّعِيرِ﴾ (شوری: ٧) واتە: (مەبەست لە دابەزاندنی قورئان بۆ تۆ ئەی محمد ئەوەیە کە دایکی هەموو شارەکان ـ مەککە ـ وە دەوروبەرەکەی ئاگادار بکەی پابەندی ئەم قورئانەبن، کە بە زمانی عەرەبی خۆیانە وە لێی تێدەگەن. وە لە ڕۆژی کۆکردنەوە کە هیچ گۆمانی تێدانییە ئاگاداریان بکەی). ﴿يَوۡمَ يَجۡمَعُكُمۡ لِيَوۡمِ ٱلۡجَمۡعِۖ ذَٰلِكَ يَوۡمُ | ﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةٖ مُّبَٰرَكَةٍۚ إِنَّا كُنَّا مُنذِرِينَ ۝ فِيهَا يُفۡرَقُ كُلُّ أَمۡرٍ حَكِيمٍ﴾ (الدخان: ٣ـ٤) واتە: پەروردگار فەرمان دەکات، کە قورئانی پیرۆز لەشەوێکی پیرۆزدا دای بەزاندووە خەڵکانی بەم قورئانە ئاگادار کردۆتەوە کە ژیانی دونیا بێ مانا نییە، بەڵکو بەهەشت هەیە بۆ چاکەکاران، وە دۆزەخ هەیە بۆ خراپەکاران. وە لەم شەوە موبارەکەدا کە قورئانی تیادا دابەزیوە ـلیلة القدرـ کارو کردەوەی چاکەکاران، وە خراپی خراپەکاران و ئەرزاق وە ئەجەلی هەموویان و گشت شتێك کە پەیوەستبێ بە وان، بەو پەری حیکمەتەوە تۆمار دەکرێت، |



| | |
|---|---|
| ٱلتَّغَابُنِ﴾ (التغابن: ٩) واتە: ئەی محمد بخە بیری گشت مرۆڤان کە ڕۆژی کۆکردنەوە هەیە، کە ڕۆژێکە جیاوازیەکی گەورە بەدی دەکرێت لە نێوان: پلە وپایەی ئیماندار، کە ئەبینێ گاور خەسارەت مەند بوو، وە باری خراپی گاور کە ئەزانێ هەموو شتێکی لە دەست چوو. | تاوەکو سالّی داهاتووی هەمان شەو، تەنها ئەو شتە ئەبێ کە تۆمارکراوە. |
| ماناکانی (موڵك) بۆ پەروەردگار ئەگەر لەناودڵی مرۆڤدا بێت، ئەوا ئەو مرۆڤە ناپرسێ بۆچی حیساب لە (یوم الجمع) لە گەڵم دەکرێت لە سەر کردەوەیەك کە پێشتر تومارکراوە لەسەر من لە (ليلة الفرق)؟! بەڵکو دەڵێت: خودا بە ڕەحمەتی خۆی ئیختیاری دامێ وە ڕێی ڕاست و چەوتی بو بەیان کردووم. ئەمەش مانای سوپاسگوزارییە بۆ خودا (الحمد لله) لە شەرعدا. وە ئینکاری ئیختیار دژایەتی عەقلە. | وە ماناکانی (حیکمەت) بۆ پەروەردگار ئەگەر لەناودڵی مرۆڤدا بێت، ئەوا ئەو مرۆڤە نا پرسێ من هیچ دەسەلاتێکم نییە ئەگەر کردەوەی خراپ بو من تومارکرابێ لە (ليلة الفرق)!؟ بەڵکو ئەترسێ لە خراپەکاری، وە چۆن بۆ پەیداکردنی ڕزق و پۆشاکی ژیان هەوڵدەدات، بە بەهەمان شێوە چاکەکاری و خوداپەرستی ئەنجامدەدات. ئەمەش مانای سوپاسگوزارییە بۆ خودا (الحمد لله) لە شەرعدا. وە جیاوازی کردن لە نێوان پەیداکردنی ڕزق و خودا پەرستی ـ کە وەکو یەك تۆمار کراون لە شەوی فەرق دا ـ دژایەتی عقلە. |

وە پێویستە مرۆڤ ئەوە بزانێ کەدەرگای بڕوابوون بە (قەدر) کاتێك خودا بۆ مرۆڤ دەکاتەوە، کە مرۆڤ ئارەزووی ملکەچی هەبێ بو پەروەردگار.

پەروەردگار دەفەرمووێت:

﴿وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ يَهْدِ قَلْبَهُۥ ۚ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ﴾ واتە: ئەگەر کەسێك ئیمان بە خودا بێنێ، ئەوا خودا دڵی ئەوکەسە ڕێنمای دەکات ـ دوور دەخاتەوە لە وەسوەسە و ئازاری بیرکردنەوەی چەوت - خودا بە هەموو شتێك ئاگادارە.

به بیرکردنەوە لە پەیوەندی نێوان (یوم الجمع) و (ليلة الفرق) وەکو لە خشتەی سەرەوەدا دیارە، دەردەکەوێت کە بڕوابوون بە قەدەر سەرچاوەکەی بە **گەورە** زانینی ناو و سیفەتەکانی خودایە ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ۝ مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ﴾ وە بەرهەمەکەی ملکەچییە بۆ بەجێگەیاندنی فەرمانەکانی خودا، کە لەسەر زاری **پێغەمبەران** پێمان گەیشتوون: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾.

وە تام و چێژی بڕوابوون بە قەدەر، خۆڕاگری و ئارامی و دڵدانەوەی مرۆڤە، لە هەموو بارێکی زەحمەتی ژیان، کە ئەگەر مرۆڤ لە هەموو مەخلوقێك نائومێد ببێ، ئەوا ئومێدەوارە بە خالق، کە دەزانێ وەڵامی دوعاکانی دەداتەوە و سەرووی هەموو دوعایێك: ﴿ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ۝ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾. (آمین) کە ڕۆژانە حەڤدە جار دووبارە دەکاتەوە.

## بیست و چوار:

### تێگەیشتنی ماناکانی (قەدەر) لە نێوان دوعاکردن و دوعانەکردن. وە هەنگاونان و هەنگاو نەنان بۆ فێربوونی زانستی شەرعی

کاتێ مرۆڤ پایەی بڕوابوون بە (قەدەر) تێدەگات، چەند دەرگایەکی **تێگەیشتن** لە ماناکانی سیفەتی (حیکمەت) بۆ پەروەردگار بە ڕووی مرۆڤی بڕواداردا دەکرێنەوە، لە وانە:

※ یەکەم: بۆی ڕوون دەبێتەوە کە تەنها ئەو مرۆڤە شایستەی دۆزەخە کە ڕۆژێك لە ڕۆژان دوعای هیدایەتی لە خودا نەکردووە، نەی فەرمووە: خودایە ڕێنمایی ڕێگای ڕاستم بکە ﴿ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ﴾. چونکە ئەوەی بەدڵەوە دوعای ڕێگای ڕاست لە خودا دەکات، هەرگیز خودا لە بەرامبەردا دوعاکەی بە هەدەر نادات، وە بەو پەڕی سۆزەوە وەڵامی دەداتەوە، وە لە زەحمەتی ژیان و تاریکستانی بێ باوەڕی ڕزگاری دەکات بۆ ڕەحمەتی ژیان و



ڕووناکی بیروباوەڕ. بەڵام ئەو کەسەی پشت لە دەسەڵاتی خودای پەروەردگار دەکات، وە لێی ناپاڕێتەوە و داوای ڕێگای ڕاست ناکات لە خودا، ئەوا ژیانی خۆی لە تاریکستانی هاوبەشی دانان بۆ خودا (شرك) دەباتە سەر، وە لە دوایشدا شایستەی دۆزەخ دەبێت، خودا بمانپارێزێت.

* دووەم: لە حیکمەتی پەروەردگارە کە هەرگیز چاکەکاری خواپەرست و خراپەکاری خۆپەرست یەکسان نەکرێن لە سزا و پاداشت لای ﴿ مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ ﴾.

پەروردگار دەفەرموویێت: ﴿ أَفَنَجْعَلُ ٱلْمُسْلِمِينَ كَٱلْمُجْرِمِينَ ۝ مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴾[١] واتە: (بیر بکەوە ئەی مروڤ، ئایا ڕەوایە پاداشتی موسڵمانانی چاکەکار وەکو تاوانبارانی خراپەکار بێ، یان سزای تاوانباران بۆ موسلمانان بێ، ئەوە چیتانە!؟ بۆچی جوان بیر لە دادپەروەری خودا ناکەنەوە؟، وە حوکم و بریاری ناڕەوا دەردەکەن!).

دەرئجامــی ئەم هەستکردنە بە گەورەی حیکمەتی پەروەردگــار، لــە فەرموودەی (والشر ليس إليك ـ شەر نادرێتەپاڵ خودا)[٢] تێدەگەین، بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە هۆی چوونە ناو دۆزەخ، نەبوونی پاڕانەوەیە لە خودا (الحاجة)، وە هەنگاو نەنانە بۆ ڕێگای ڕاستی خوداپەرستی (الجهل)، ئەمانەش نەبوون(عدم)ن نادرێتە پاڵ خودا [٣].

ئەم دەرگایەی زانست تەنها بە تەسلیم بوون بۆ پەروەردگار دەکرێتەوە، وە ناوی (ئیسلام)یش ـ کە ئاینی گشت پێغەمبەرانە ـ هەر لەم تەسلیم بوونەوە هاتووە.

﴿ فَإِنْ حَآجُّوكَ فَقُلْ أَسْلَمْتُ وَجْهِيَ لِلَّهِ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِ ۗ وَقُل لِّلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْأُمِّيِّۦنَ ءَأَسْلَمْتُمْ ۚ فَإِنْ أَسْلَمُوا۟ فَقَدِ ٱهْتَدَوا۟ ۖ وَّإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّمَا عَلَيْكَ ٱلْبَلَٰغُ ۗ وَٱللَّهُ بَصِيرٌۢ بِٱلْعِبَادِ ﴾[٤] .

---

(١) (القلم: ٣٥ ـ٣٦).

(٢) صحيح ابن حبان ٥\٧٢ـ٧٣.

(٣) ينظر: مجموعة الفتاوى لشيخ الإسلام ١٤ \٢٢.

(٤) (آل عمران:٢٠).

## بیست و پێنج:

### سوورەتی فاتیحە و بنەماکانی بانگەواز بۆ پەیامی پێغەمبەران (علیهم السلام)

کاتێ گەورەیی مانای ئایەتەکانی فاتیحە بۆ موسڵمان ڕوون دەبنەوە، ئەوا موسڵمان پەرۆشی بانگەواز کردن دەبێت بۆ ئەم مانایانە، وە سوورەتی فاتیحە بنەماکانی ئەم بانگەوازەی تێدایە، کە ڕیزبەندی ئەم سێ خاڵانەن وەکو سێ قۆناغی بانگەواز بۆ خوداپەرستی:

**یەکەم: (بانگەواز بۆ بەگەورە دانانی خودا لە دڵاندا بە ناوە بەرزەکانی، وە سیفەتە جوانەکانی ـ الدعوة الی توحید الأسماء و الصفات)**

بانگەواز بۆ سوپاسگوزاری کردنی پەروەردگار ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ﴾ **کە بە گەورەدانانی خودایە لە دڵاندا قۆناغی یەکەمی بانگەوازە بۆ خوداپەرستی کە قۆناغەکانی تر بۆی دەگەڕێنەوە. وە ڕێگای ئەم بانگەوازە هاندانە بۆ بیرکردنەوە لەو جیهانەی کە خودا دروستی کردووە، وە بن دەستەی(موسەخەر) کردووە بۆ مرۆڤ، وەك لەم ئایەتە پیرۆزە ئاماژەی بۆ کراوە:** ﴿وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾[1] **واتە: (ئەی مرۆڤ ئەوەی لە زەمین و ئاسمانانە هەمووی بۆ تۆ بن دەست کراوە، تۆش بیر بکەرەوە لەم ڕێزلێنانەی خودا بۆ تۆ، وە تەنها بەندایەتی ئەو بکە و لە سوپاسگوزاری ئەو غافل مەبە).**

**ئەم بیرکردنەوە شەرعییە دەمان گەیێنێت بە هەبوونی حیکمەتێکی گەورە لە پاڵ ژیانمان، کە هەرگیز خودا ئەم ژیانەی بە فیڕو و بێ مەبەست دروست نەکردووە، وەك لەم**

---

(١) (الجاثية :١٣).

ئایەتە پیرۆزە ئاماژەی بۆ کراوە: ﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ﴾[١]. واتە: (ئەی خەڵکینە ئێوە وا دەزانن کە ئێمە بە بێ مەبەست ئێوەمان خەلق کردووە؟ وە بومان ناگەڕێنەوە؟! ئەگەر وا بیر بکەنەوە زۆر نەفامن !! وە ئەگەر جوان بیربکەنەوە تەنها بەندایەتی خالق دەکەن ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾، وە لە گشت ئەرکەکانی ژیانتان سوپاسگوزاری بۆ ئەو دەنوێنن ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾، وە خۆتان بۆ گەڕانەوە ئامادەدەکەن، گەڕانەوەیەك بۆ ﴿مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ﴾، کە هەرگیز چاکەکار و خراپەکار یەکسان ناکات ﴿أَفَنَجْعَلُ الْمُسْلِمِينَ كَالْمُجْرِمِينَ﴾[٢]، بەڵکو بۆ چاکەکار پاداشت هەیە، وە بۆ خراپەکار سزا هەیە، بە پێی پەیامی قورئان کە گشت بنەماکانی فەرمان کردن بە چاکە و نەهی کردن لە خراپە تیادا ڕوونکراوەتەوە: ﴿أَيَحْسَبُ الْإِنسَانُ أَن يُتْرَكَ سُدًى﴾[٣] واتە: با مرۆڤ وا تێنەگات وازی لێ ئەهێنرێت بێ ئەوەی ئەرك و فەرمانەکانی ژیان بۆی بەیان بکرێت، وە بێ ئەوەی لەسەر ئەم ئەرك و فەرمانانە لێپرسینەوەی لە گەڵ بکرێت ! ئەمە پێچەوانەیە بۆ حیکمەتی پەروەردگار، بەڵکو گەورەترین چاکەی پەروەردگار لە گەڵ مرۆڤ ـ کە شایستەی هەموو سۆپاسگۆزارییەکە ـ ئاگادارکردنەوەی مرۆڤایەتییە لە ڕێی پێغەمبەرانەوە (علیهم السلام) بە مەبەستەکانی ژیان لە سەر ئەم زەمینە، کە بەندایەتی ڕاستەقینەیە بۆ پەروەردگار: ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾[٤] واتە: (جنوکە و ئینسانم بۆ هیچ مەبەستێك خەلق نە کردووە بێجگە لە بەندایەتی).

---

(١) (المؤمنون: ١١٥).

(٢) (القلم:٣٥).

(٣) (القيامة:٣٦).

(٤) (الذاريات:٥٦).

ئاگادارکردنەوەی مروڤایەتی لەم ئەرکە، کە یەکەم ئەرکی بانگەوازە بۆ ڕێگەی پێغەمبەران (علیهم السلام)، هەر بۆیەش یەکەم ئەرکە کە بانگەوازکار لەسەرخۆی جێبەجێ بکات، کە ژیاندنەوەی ماناکانی سوپاسگوزاری خودایە لە دڵدا ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾.

**دووەم: (بانگەواز بۆ بڕوابوون بە هەبوونی سزاو پاداشت لە ڕۆژی کۆتایی ـ الدعوة إلى الإيمان بالثواب و العقاب الآخروي )**

**بانگەواز بۆ هەبوونی پاداشت** ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾، وە سزا ﴿مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ﴾ لە پاڵ ئەم ژیانەی کە ئەژین، وە هاندان بۆ بیرکردنەوە لە ترسی دۆزەخ، وە ئومێدەواری بە بەهەشت ﴿وَٱدۡعُوهُ خَوۡفٗا وَطَمَعًا﴾[1] واتە: (بۆ خودا لەترسی دۆزەخ و ویستنی بەهەشتا بەندایەتی بکەن، وە لە خودا بپارێنەوە )، وە (ترسی ئاگر، و ویستی بەهەشت ) باشترین هاندەرن بۆ چاکەکاری و دوورکەوتنەوە لە خراپەکاری.

ئەم قۆناغەی بانگەواز دەتوانین بڵێین هاوتەریبە لەگەڵ قۆناغی یەکەم، وە دابەزینە یەکەمەکانی قورئانی پیرۆز لە مەککە لەم دوو خاڵە کۆدەبنەوە:

* **یەکەمیان: ناسینی خودایە بە ناوە جوانەکانی، وە بە سیفەتەبەرزدکانی کە خوشەویستی خودا لە دڵی مرۆڤدا دروست دەکات، ئەمەش بنچینەی سوپاسگوزارییە بۆ خودای پەروەردگار** ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾، **کە کاروانی یەك خوداپەرستی لە وێوە دەست پێدەکات. بۆیە کاتێ پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) یەکێ لە هەڤاڵانی بەرێ دەکات** بۆ بانگەواز لە وڵاتی یەمەن پێی ئەفەرموێت: ((فليكن أول ما تدعوهم إليه شهادة أن لا إله إلا الله و أني رسول الله))[2] **وە لە ریوایەتی (بوخاری)ـدا**[3] **((فليكن أوَّل ما تدعوهم**

---

(١) (الأعراف:٥٦).

(٢) الجامع الصحيح لسنن و المسانيد ١\٢٠.

(٣) البخاري ٧٣٧١ .

إلى أن يوحدوا الله تعالى)). واته: با بانگەوازەکە بە ماناکانی یەك خوداپەرستی دەست پێ بکات، کە بەگەورەدانانی خودایە لە دڵاندا (لا إله إلا الله) وە بەندایەتی خودایە بە پێی پەیامی محمد (صلى الله عليه وسلم) (أني رسول الله)، ئەمانە بنەمای سوپاسگوزارین بۆ پەروەردگار ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾.

* دووەمیان: ترسی دۆزەخ و ویستی بەهەشت، کە هۆکاری دوورکەوتنەوەی موسڵمانە لە خراپە، چونکە دەزانن خودایەك کە ﴿مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ﴾ لێپرسینەوەیان لە گەڵدەکات لە سەر خراپەکاری، وە هۆکاری نزیکبونەوەی موسڵمانانە لە چاکە، چونکە دەزانن خودایەك کە ﴿ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ پاداشتی چاکەکارییان دەداتەوە.

هەر لە بەر ئەمەش یەکەم جار باسی بەهەشت و دۆزەخکرا لە سەرەتاکانی بانگەواز لە مەککەی پیرۆز، دواتر لە مەدینە باسی حەرامکردنی ئارەق کرا، وە ئەگەر یەکەم جار باسی حەرام کردنی ئارەق کرابا، خەڵك دەستی لێ هەڵنەدەگرت.

**سێیەم: (بانگەواز بۆ دەستگرتن بەو کارانەی پەروەردگار فەرمانی پێکردوە، وە دوورکەوتنەوە لەو کارانەی پەروەدگار نەهی لێکردووە ـ الدعوة إلى الإلتزام بالأوامر و النواهي)**

مەبەست لەم خاڵە زیاتر ئەحکامە فیقهییەکانە لە (حەلال) و (حەرام) کە قۆناغی پاش جیاوازی کردنی نێوان کوفر و ئیمانە، وە لەم خاڵەدا وەکو دوو خاڵەکەی پێشتر تەنها قورئان و فەرمودە تەرازووی چاکە و خراپەن، نەك عەقل و بۆچوون و هەوا و هەوەسی مرۆڤ. بۆیە کاتێ بمانەوێت بەپێی سوورەتی فاتیحە لە کار و کردەوەکانی مرۆڤی موسڵمان بڕوانین دەبینین کە بنیات نراون لەسەر دوو بنەما:

١ ـ دڵسوزی (إخلاص) بو خودا: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ ئەمە لە بیروباوەر و ناخی مرۆڤدا.

٢ ـ پابەندبوون بە بەڵگە ﴿ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ۝ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾ ئەمە لە کاروکردەوی دیاری مرۆڤدا.

بۆیە بانگخواز بۆ ڕێگای خودا گشت هەڵسوکەوتێکی بەم دوو بنەمایە بەستراوەتەوە، وە گشت بانگەوازێکی بۆ ئەم دوو بنەمایە دەگەڕێتەوە. کەواتە پێویستە شارەزابێ لە قورئان و فەرموودە، تاوەکو بە دڵسوزی خودا پەرستی بکات، وە تەنها بە بەڵگەی قورئان و فەرموودە خودا پەرستی بکات، نەك بە شێوازی داهێنراوی (بدعە) دوور لەوەی کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و هەڤاڵانی لەسەرن.

بۆیە لێرەوە سەرپێچی پەروەردگار کە پێویستە موسڵمان لێی ئاگادار بێت یان لێی ئاگادار بکرێتەوە دەکرێتە دوو جۆر:

جۆری یەکەم: سەر پێچی دەرنجامی توڕەیی یان شەهەوات. ..هتد. کە سەرپێچیکار دەزانێ سەر پێچییە، بەڵام تووش بوود چونکە لە کاتی سەرپێچیکردن نەگەیشتوتە پلە بەرزەکانی ﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ﴾. ئەمەش کەم تەرخەمییە لە بەجێگەیاندنی بەشی یەکەمی وشەی شەهادە کە(لاإله إلاّ الله)یە.

جوری دووەم: سەرپێچی دەرنجامی پێشخستنی عەقل و هەوەس لەسەر بەڵگەکانی قورئان و فەرموودە، کە سەرپێچیکار کارە ناشەرعیەکەی بە خوداپەرستی تێدەگات، لە کاتێکدا کە:

* بەڵگەی پێنییە، ئەمەش دوور کەوتنەوەیە لە ﴿ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ﴾!.

* وە بە ڕێگایەکە کە موسڵمانە پێشینەکان لە سەری نەبوونە ئەمەش دوور کەوتنەوەیە لە ﴿صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ﴾!.

کەواتە ئەم سەرپێچییە لەکاتێك دا ڕوودەدات کە سەرپێچکار نەگەیشتبێتە پلەی جوان تێگەیشتنی: ﴿ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ۝ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ﴾! ئەمەش کەمتەرخەمییە لە بەجێگەیاندنی بەشی دووەمی وشەی شەهادە (محمدٌ رسول الله).

وە ئەوەی شیاوی باس بێت لێرەدا ئەوەیە کە جۆری دووەمی سەرپێچی ترسناك ترە، چونکە سەرپێچکار خۆی بە ڕاست دەزانێ، بۆیە دوورترە لە گەڕانەوە بۆ ﴿ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ﴾ بە تۆبەکردن، هەر بۆیەش پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم) لە وەسیەتەکەی بۆ هەڤاڵانی دەی فەرموو: (كل بدعةٍ ضلالة)[1]، واتە: (هەموو شێوازێکی داهێنراو لە خوداپەرستیدا گۆمڕاویە) لە پێشەکی وتارەکانیدا پاش سوپاسگوزاری خودا دەی فەرموو: (إن خير الحديث كتاب الله، وخير الهدي هدي محمد، و شرَ الأمور محدثاتها، و كل مُحْدثةٍ بدعة)[2]، واتە: (باشترین گوفتار قورئانی پیرۆزە، وە باشترین ڕێباز ڕێبازی محمد(صلى الله عليه وسلم)، وە خراپترین کار کارە داهێنراوەکانە لە خودا پەرستیدا، وە هەموو کارێکی داهێنراو لە خوداپەرستیدا زیادەیە ) ئیسلامیش زیادە قەبوول ناکات چونکە پەیامی ئاسمانە، نەك داهێنراوی عەقلی خەڵکان.

پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗا﴾[3] واتە: (بەم دوا ئایەتەی قورئان دینی ئیسلام کامل بو، و چاکەی پەروەردگار بە سەرمرۆڤایەتیدا بە جێگەیشت، وە پەروەردگار تەنها بە ئیسلام رازییە کە خودا پەرستی پێبکرێت)، وە پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم) بەو پەڕی جوانی ئەم پەیامەی گەیاندووە، کەواتە ئەوەی لە سەردەمی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) وە هەڤاڵانی خوداپەرستی نەبێ ئەمڕو نابێتە خوداپەرستی.

ئەم بنەمایانەی تێگەیشتنی قورئان و فەرموودە گشت قۆناغەکانی بانگەواز دەگرنەوە بەڵام لێرەدا مەبەستمان قۆناغی دەستگرتنە بە فەرمانەکانی خودای پەروەردگار سەبارەت بە

---

[1] أخرجه أحمد ٢٨\٣٧٤وغيره.

[2] أخرجه أحمد ٢٣\٢٣٤ و غيره.

[3] (المائدة:٣)

چۆنیەتی (عبادات) و ئەحکامەکانی (حەلال) وە (حەرام) کە بەڵگەکانی ئەم قۆناغە بەزۆری لە مەدینە دابەزیون.

وە گشت ئەم ئەحکامانە لە سەر یاسای: (الأصل في العبادات المنع ـ ئەسل ئەوەیە کە بەبێ بەڵگە خوداپەرستی ناکرێت ـ ) دەسوورێنەوە.

❊ ❊ ❊ ❊

بە وەستانمان لە بیست و پێنج وێستگەی ڕابردوو لەسەر مانابەرزەکانی سوورەتی فاتیحە، هزراندنی ئایەتە پیرۆزەکانی، بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە فاتیحە پوختەی قورئانە، وە قورئانی پیرۆز تەفسیری فاتیحەیە، وە هیچ ئایەتێك لە قورئاندا نییە ئەگەر پەیوەندی بە فاتیحەوە نەبێ، وە تێگەیشتنی فاتیحە مەرج نەبێ لە تێگەیشتنی ئەو ئایەتە. ئەمەش وامان لێدەکات کە زیاتر لەگەڵ ماناکانی فاتیحە بەردەوام بین لە بەشی دووەم دا ـ إنشاء الله ـ

❊ ❊ ❊ ❊

﴿وَوَهَبْنَا لَهُم مِّن رَّحْمَتِنَا وَجَعَلْنَا لَهُمْ لِسَانَ صِدْقٍ عَلِيًّا﴾ مریم ٥٠

# خەلیفەی یەکەم (أبو بکر الصدیق ـ رضي الله عنه)
# وە ژیاندنەوەی ماناکانی: (لا إله إلا الله ، محمد رسول الله)
# پاش مردنی پێغەمبەرمان صلی الله علیه وسلم

مرۆڤی گەورە ئەوەنییە کە ئامێرێکی پێشکەوتوو دروست بکات، بەڵکو ئەوەیە کە مرۆڤی گەورە دروست بکات، چونکە ئاسودەیی مرۆڤایەتی لە کاری مرۆڤایەتی مرۆڤە، نەك لە کاری ئامێرەکان. وە دەتوانین بڵێین زۆر لە داهێنراوە پێشکەوتووەکان مرۆڤی خاوەن کەسایەتی ناتەندروست دژی مرۆڤایەتی بەکار دەهێنێ، بۆیە ئەرکی پەروەردە کردنی مرۆڤ لە ئەرکی داهێنانی ئامێرەکان گەورەترە، کەواتە گەورەترین خزمەت بۆ مرۆڤایەتی پەروەردەکردنی مروڤە لە سەر مانا بەرزەکانی ژیان.

پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم) کە گەورەترین ماموستای پەروەردەکردنی مرۆڤە، توانی لەماوەی (٢٣) ساڵی دابەزینی قورئانی پیرۆز دا خەڵکانێك پەروەردەبکات، کە بتوانن ماناکانی ژیان بە مرۆڤایەتی بگەیێنن، وە لە گشت لایەنەکانی ژیان چاکسازی بکەن و ڕووی مرۆڤ بخەنە پایەکانی ڕەوشت بەرزی، کە بە هەڤالانی ئەو ناسراون (الصحابة ـ رضي الله عنهم ـ)، وە لە سەروی هەموویان (الخلفاء الراشدین ـ أبوبکر، عمر، عثمان، علي ـ رضي الله عنهم ـ) ئەمانە پەیامەکەی ئیسلامیان بە دونیا گەیاندووە. پێغەمبەرمان ئاماژە بەم مانایانە دەکات، کاتێ دەفەرمێ:

[1]. واتە: (دەست بە ڕێگای منەوە بگرن، وە هەروەها دەست بەڕێگای خەلیفە راشیدیەکانم بگرن، کە لەسەر ڕێگای هیدایەتن، وە نەی فەرموو (عضوا **علیهما** بالنواجذ) بەڵکو فەرمووی (عضوا **علیها** بالنواجذ) تا وەکو بە یەك ڕێگا

---

(١) رواه أحمد ١٧١٤٢ و الترمذي ٢٦٧٦و قال حسنٌ صحیح .

بیژمێرێن، واتە: چۆن ڕێگای من پێویستە بە ددان بیگرن، **هەمان شت ڕێگای خەلیفە** ڕاشیدینەکانم ).

**ئەمەش لە بەر ئەوەیە کە** پەیامی ئاسمان ـ قورئانی پیرۆز ـ **کە پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم) بەیانی کردووە**، باشترین کەس کە لەم پەیامە تێگەیشتبن و بتوانن لە ڕووداوە نوێکانی ژیاندا بەکاری بهێنن هەڤاڵەکانی ئەون (صلی الله علیه وسلم)، وە لە سەروی هەموویان چوار خەلیفەکەی ئەو، کە پاش ئەو جڵەوی کاریان لە دەست بووە، وە بنەماکانی ئایینیان لە سەر ڕووداوە نوێیەکان چەسپاندووە، کە نابێ سەرپێچی ڕێگای ئەوان بکرێت لە تێگەیشتنی بنەماکانی ئاین، هەر وەکو چون نابێ سەرپێچی ڕیگای پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم) بکرێت.

هەر بۆیە زانایانی (أهل السنة) شوێنکەوتەی قورئان و سوننەتن بە تێگەیشتنی ئەو بەرەبابەی کە پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم) پەروەردەیکردوون، ئەوانەش هەڤاڵانی پێغەمبەرن (صلی الله علیه وسلم) لە کوچبەران و پشتیوانان (مهاجرین و ئەنصار)، وەك لە ئایەتی (١٠٠)ی سوورەتی (التوبة) ئاماژە بۆ ئەم مانایە دەکرێت: ﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلۡأَوَّلُونَ مِنَ ٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحۡسَٰنٖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُ وَأَعَدَّ لَهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي تَحۡتَهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ﴾ واتە: (ئەوانە کە دەست پێشخەر بوون لە ئیسلام بووندا لە کۆچبەران ـ لە مەککە ـ وە ئەوانەی پشتیوانانی ئەوان بوون ـ لە مەدینە ـ **وە ئەوانەی شوێنکەوتووی ئەمانەن بە چاکە** خودا لێیان ڕازیبووە ئەوانیش لە خودا ڕازیبوون، وە خودا بەهەشتی بۆ ئامادەکردوون، کە بۆ هەتا هەتایە لە ناویدا دەژین، ئا ئەمەیە بردنەوەی گەورە).

کەواتە بردنەوە لە شوێنکەوتنی تێگەیشتنی هەڤاڵانی ئەم پێغەمبەرەیە (صلی الله علیه وسلم) بۆ قورئان و سوننەت ـ بە تایبەت تێگەیشتنی خەلیفەکانی ـ کە پەروەردەی

پێغەمبەرن (صلى الله عليه وسلم)، وە گەورەییان (رضي الله عنهم ) نیشانەیەکە لە نیشانەکانی گەورەیی پێغەمبەرمان محمد (صلى الله عليه وسلم).

بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی ئەم بابەتە، لە سەر لاپەڕەیەکی پڕشنگداری ژیانی خەلیفەی یەکەم (أبوبكر الصديق ـ رضي الله عنه ـ) ڕادەوەستین، تاوەکو مانا بەرزەکانی گەورەترین (وشە) لە ئیسلامدا فێرمان بکات کە وشەی: (لا إله إلا الله محمد رسول الله) یە، لەو چرکە ساتانەی کە پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) وەفاتی کرد. ئەمەش لە دوو ڕووداودا دەخەینە ڕوو:

## ڕووداوی یەکەم:

## ڕووداوی مردنی پێغەمبەرمان ( صلى الله عليه وسلم ) وە تێگەیشتنی مانا بەرزەکانی ( لا إله إلا الله ).

جیاوازی کردن لە نیوان (الخالق) و (المخلوق) بابەتی هەرە گەورەی قورئانی پیرۆزە، کەنابێ بە هیچ شێوەیەك سیفەتەکانی (خالق) بدرێتە پاڵ (مخلوق)، یان سیفەتەکانی (مخلوق) بدریتە پاڵ (خالق).

بۆ چەسپاندنی ئەم بیروباوەڕە لە دڵی خەڵکدا لە قورئانی پیرۆز و فەرموودەی پێغەمبەرمان(صلى الله عليه وسلم) زۆر باس لە مردنی پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) کراوە بە جۆرەها شێواز لەوانە:

١ ـــ قورئانی پیرۆز موسڵمانان بەشێوەیەکی کرداری (عملی) فێردەکات. کەچۆن لە پاش مردنی پێغەمبەریان (صلى الله عليه وسلم) دەژین:

لە گەرمەی شەڕی (ئوحد)دا موسڵمانان لە ساتێکدا وایان دەزانی کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) شەهید بووە!.



**زانایان لە پەند وەرگرتن لەو (چرکە ساتە )، بۆ ئەوە دەچن کە مەبەست فێرکردنی موسڵمانان بووە، تاوەکو بتوانن بە شێوەییەکی کرداری(عملی) پاش مردنی پیغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) بژین بە بێ ئەو. وە قورئانی پیرۆز ئەو چرکە ساتە تۆمار دەکات لە ئایەتی (١٤٤)ی سوورەتی (آل عمران):** ﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَـٰبِكُمْ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيْـًٔا وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ ٱلشَّـٰكِرِينَ﴾ **واتە: (محمد وەکو هەر پێغەمبەرێکی پێش خۆی تەنها هەڵگری پەیامی خودا بووە، وە پێغەمبەران گشتیان کە پایەبەرزترین مرۆڤن سیفەتی ژیانی (کامل)یان نییە، بەڵکو دەمرن یان دەکوژرێن، وە تەنها خودای پەروەردگار سیفەتی ژیانی (کامل)ی هەیە کە هەر ئەمێنێ، بۆیە بۆتان نییە کاتی مردنی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) هەڵگەرێنەوە و پشت لە پەیامی خودا بکەن، کە پەیامی خوداپەرستییە نەك مرۆڤپەرستی. وە هەرکەسێ پشت لە خودا پەرستی بکات پاش مردنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و هەڵگەرێتەوە، ئەوا زیان بە خۆی ئەگەینێ نەك بە خودا، چونکە تووشی سزا ئەبێ. وە هەر کەسێ لە سەر راستی خوداپەرستی بژیت، ئەوا شوکرانەی کردووە، خودا پاداشتی دەداتەوە)**[1] .

٢ ــ قورئانی پیرۆز ـ لە چەندین ئایەتدا ـ موسڵمانان لە مردنی پیغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) ئاگادار دەکاتەوە لە بەرەبەرەی مردنی.

* لەوانە: **کاتێ سوورەتی (النصر) دادەبەزی:** ﴿إِذَا جَآءَ نَصْرُ ٱللَّهِ وَٱلْفَتْحُ ۝ وَرَأَيْتَ ٱلنَّاسَ يَدْخُلُونَ فِى دِينِ ٱللَّهِ أَفْوَاجًا ۝ فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَٱسْتَغْفِرْهُ إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابًۢا﴾ **واتە: (کاتێ سەرکەوتن لەلای خودایەوە دێت وە مەککە رزگار دەکرێت، وە ئەبینی کە خەڵکان پۆل پۆل دێنە ناو ئیسلام، ئەوکات (سبحان الله) و (الحمد لله) بڵێ و داوای تەوبە و لێخۆشبوون لە خودا بکە، چونکە بە ڕاستی خودا تەوبە قەبوول دەکات ).**

---

(١) ینظر: زاد المعاد ٣\٢٢٤.



پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە کاتی دابەزینی سوورەتەکەدا بە هەڤاڵانی ئەفەرموو: (نُعِيَت إلىَّ نَفْسي)[١] واتە: خودا هەواڵی نزیکی مردنی منی بەم سوورەتە پێ ڕاگەیاندم. وە هەر لەو ساڵەدا کۆچی دوایی دەکات.

* لەوانە: کاتێ ئایەتی (٣)ی سوورەتی (المائدة) کە باس لە تەواوی پێگەیشتنی ئیسلام دەکات: ﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا﴾ دادەبەزێ، کە لە سەر وتەی زۆر لە زانایان دوا ئایەتی قورئانە لە دابەزیندا، خەلیفەی دووەم (عمر بن الخطاب ـ رضي الله عنه ـ )دەگرییێ و دەفەرموو: پەروەردگار تەواوی ئیسلامی پێ ڕاگەیاندین، وە پاش تەواوی هەموو کارێك کەم و کوڕی دەست پێدەکات [٢]، وە سەرەتای پەیدابوونی کەم و کوڕی مردنی پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم) بوو.

٣ ــ قورئانی پیرۆز باس لە چەندین ئەحکامی شەرعی دەکات کە پەیوەندیدارن بە مردنی پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم) لەوانە:

لە ئایەتی (٦)ی سوورەتی (الأحزاب) ﴿وَأَزْوَٰجُهُۥٓ أُمَّهَٰتُهُمْ﴾ واتە: کاتێ پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) ئەمرێ خێزانەکانی کە دایکی موسڵمانانن، بۆیان نییە شووبکەنەوە.

٤ ــ لە فەرموودەکانی پێغەمبەرمان(صلی الله علیه وسلم)باسی مردنی پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم) بە زۆر شێوە دووبارە بووتەوە.

* لەوانە: پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم ) باس لە ئەحکامی گۆڕە پیرۆزەکەی خۆی دەکات:

---

(١) أخرجه احمد ١\٢١٧ و ينظر قصة عمر و ابن عباس مع أشياخ بدر في البخاري ٤٩٧٠.

(٢) ينظر: تفسير الدر المنثور٢\٤٥٦ و تفسير ابن كثير ٣\٣٢.

((اللهم لا تجعل قبري وثنا يعبد، اشتد غضب الله على قوم اتخذوا قبور انبياءهم مساجد))[١] واتە: خودایە گۆڕەکەم بپارێزی لەوەی کە وەکو بت بپەرسترێت، خودا غەزەب لەو کەسانە دەکات کە گۆڕی پێغەمبەرانیان دەکەنە مزگەوت. وە دەفەرمووێت: ((لعنة الله على اليهود والنصارى: اتخذوا قبور أنبيائهم مساجد))[٢] واتە: نەفرەتی خودا لە جولەکە و دیانەکان بێت، چونکە گۆڕی پێغەمبەرەکانیان دەیانکردە مزگەوت.

※ وە ئەوانە: پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) باس لە میراتی خۆی دەکات: (لا نورث ما تركنا صدقة)[٣] واتە: پاش مردن میرات بۆ نەوەکانم بەجێ نامێنێ ئەوەی مابێ صەدەقەیە.

※ وە ئەوانە: زۆر جار پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم ) هەڤاڵانی ئاگادار دەکردەوە لە ڕووداوی مردنی دەی فەرموو: ((قال جبريل يا محمد عش ما شئت فإنك ميت)) [٤] واتە: (جبريل عليه السلام فەرمووی: ئەی محمد (صلى الله عليه وسلم) چەند ئەتەوێ بژی، بەڵام کۆتایەکە مردنە!).

※ وە ئەوانە: پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) لە زیکر و دوعایەکانی ماناکانی مردنی دووبارە دەکردەوە بۆ هەڤاڵانی و دەی فەرموو: ((الجن و الإنس يموتون و الله حيّ لا يموت))[٥]. واتە: (جنوکە و مرۆڤ دەمرن تەنها خودا زیندووە، نامرێت ).

ئەمە بێجگە لە دەیان ئایەت و فەرموودەی تر کە بە شێوازی جیا جیا باس لە وە دەکەن، کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) مەخلوقە دەمرێ، وە خودا خالقە دەپەرسترێت.

---

(١) رواه مالك في الموطا و أحمد في المسند ـ ينظر: فتح المجيد ص٢٦٩.

(٢) رواه الشيخان ينظر: فتح المجيد ص\٢٥٦.

(٣) رواه الشيخان.

(٤) أخرجه الطيالسي ٣\٣١٣ط التركي و الحاكم في المستدرك ٤\٣٦٠ وصححه وأقره الذهبي.

(٥) أخرجه أحمد بنحوه ٢٧٤٨ و غيره.

سەرەڕای ئەمەش کاتێ هەڤاڵان (رضي الله عنهم) هەواڵی مردنی پێغەمبەریان زانی لە هەژمەتا ئەم هەموو مانایانە لە بیر دەکەن، وە زۆربەیان ڕایان وابوو کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نەمردووە، وە ئینکاری مردنی پێغەمبەریان کرد!! [١]، لەم کاتە ناسکەدا خەلیفەی یەکەم ماناکانی پەیامی ئاسمان (لا إله إلا الله) لە دەروونی هەڤاڵاندا زیندوو دەکاتەوە لە ووتارێکدا کە دەفەرمووێت: (أيُّها الناس، من كان منكم يعبد محمدا فإن محمداً قد مات. و من كان يعبد الله. فإن الله حيٌّ لا يموت. قال الله تعالى: ﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ الرُّسُلُ أَفَإِن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ انقَلَبْتُمْ عَلَىٰ أَعْقَابِكُمْ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ اللَّهَ شَيْئًا وَسَيَجْزِي اللَّهُ الشَّاكِرِينَ﴾ ). واتە: (ئەی خەڵکینە، ئەگەر کەسێکتان (محمد) پەرست بێ، ئەوا (محمد) مرد، وە ئەگەر ئێوە خودا پەرست بن، ئەوا خودای پەروەردگار زیندووە و نامرێت ) پاشان ئایەتی(١٤٤)ی سوورەتی(آل عمران) بۆیان خوێندەوە: (محمد ـصلى الله عليه وسلم ـ) تەنها پەیام هەڵگری خودایە پێش ئەویش چەندین پێغەمبەر هاتوون، ئایا ئەگەر ئەمانە بمرن یان بکوژرێن ئێوە پشت لە پەیامی خودا دەکەن؟! وە ئەوەی پشت لە پەیامی خودا بکات زیان بەخودا ناگەیێنی، وە خودا پاداشتی ئەوانە دەداتەوە کە سوپاسگوزاری خودا دەکەن بە پابەندبوون بە پەیامەکەی).

کاتێ هەڤاڵان ـ رضي الله عنهم ـ گوێبیستی وتارەکەی (أبوبكر الصديق ـ رضي الله عنه ـ) دەبن دێنەوە هۆش خۆیان، دەزانن مردنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) مردنی پەیامی (لا إله إلا الله) نییە، چونکە ئەمە پەیامی خوداپەرسییە نەك مرۆڤپەرستی، وە پەیامی هەموو مرۆڤایەتی یە لە هەر کات و شوێنێك بێ، نەك پەیامێکە بۆ تەنها کەسانێك یان سەردەمێك، بەمردنی ئەم کەسانە یان تێپەرینی ئەم سەردەمە کۆتایی پێ بێ[٢].

---

(١) ينظر :صحيح ابن حبان ١٤\٥٨٨ وأبوبكر الصديق لعبد الستار الشيخ ص ٢٥٠\.

(٢) ينظر: صحيح ابن حبان ١٤\٥٨٩.

## ڕووداوی دووەم:

## ڕووداوی فەرمانکردن بە لەشکری ئوسامە بۆ شەڕی ڕۆم. وە تێگەیشتنی مانا بەرزەکانی ( محمد رسول الله )

لەو ڕووداوانەی جێی گفتوگۆ بوون لای هەڤاڵان (رضي الله عنهم) لە ساتەکانی مردنی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، وە دەست بەکاربوونی خەلیفەی یەکەم (أبو بكر الصديق ـ رضي الله عنه ـ) ڕووداوی دەرچوونی (۳۰۰۰) سێ هەزار سەربازی موسڵمانان بوو، بۆ شەڕی (ڕۆم) کە پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی پێکردبوون، بەسەرۆکایەتی (أسامه بن زيد ـ رضي الله عنهما ـ ) ، وە لەدەرەوەی شاری مەدینە لە ئامادەباشی بەرێکەوتن دا بوون، بەڵام پێش بەڕێکەوتنیان هەواڵی مردنی پێغەمبەریان پێدەگات، وە لە دەرەوەی (مەدینە) لە سەربازگەکەیاندا دەمێننەوە، سەرکردەکەیان دەگەڕێتەوە (مەدینە) تاوەکو گوێبیستی فەرمانی خەلیفەی یەکەم بێ لەسەر بارودۆخە نوێیەکەی پاش مردنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم).

لە شاری مەدینە هەڤاڵان (رضي الله عنهم) ڕایان وابوو لەشکرەکەی (ئوسامە) بۆ پاراستنی مەدینە و خێزانەکانی پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) لەم بارودۆخە ناسکەدا بمێنێتەوە و دەرنەچێ بۆ شەڕی (ڕۆم)، وە زۆر جەختیان لەمە دەکرد، چونکە لەگەڵ هەواڵی مردنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، هەواڵی هەڵگەڕانەوەی خەڵکانێکی زۆر لە دەرەوەی مەدینە پێیان گەیشت، کە ترسناکی ئەمانە لە ترسناکی (ڕۆم) زیاترە بۆ سەر مدینە، وە هەڵسەنگاندنی ڕووداوێکی لەم چەشنە مەعقولییەتێکی زۆر دەدات بەم بۆچوونە، بەڵام ئایا هەڵوێستی (أبو بكر الصديق ـ رضي الله عنه ـ) چی ئەبێت؟؟.

لەم بارە ناسکەدا (أبو بکر الصدیق ـ رضي الله عنه ـ) وتارێك دەدات تیایدا ماناکانی (محمدٌ رسول الله) لە دڵی هەڤاڵاندا(رضي الله عنهم) زیندوو دەکاتەوە و دەفەرمووێت:

(و الذي لا إله إلا هو، لو جرّت الكلاب بأرجل أزواج رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ ما رددت جيشا و جّهه رسول الله صلى الله عليه وسلم. ..)[١] واته: (سوێند بەو خودایەی کە تاکە خودایە بەحەق بپەرسترێت، ئەگەر سەگ و دڕندە قاچی خێزانەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە مەدینە راکێشن و بیبیان خۆن ! لەشکرێك دواناخەم کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمانی دەرچوونی پێ کردبێت. ..).

هەڤاڵان (رضي الله عنهم) کاتێ گوێبیستی ئەم وتارە دەبن، گشتیان بە یەك دەنگ پابەندی دەبن، وە ماناکانی (محمدٌ رسول الله) لە ناو دڵیاندا زیندوو دەبێتەوە.

کەواتە هەروەکو چۆن لە ڕووداوی یەکەم أبو بکر الصدیق (رضي الله عنه) ماناکانی (لا إله إلا الله) لە دڵی هەڤاڵانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)دا زیندوو کردەوە، بە وتارێکی پڕ لە ماناکانی خوداپەرستی و جیاوازیکەر لە نێوان مافەکانی (خالق) کە ئەپەرسترێت و نامرێت، وە مافەکانی(مخلوق) کە ـ ئەگەر پێغەمبەریش بێت ـ ناپەرسترێت و ئەمرێت .

بەهەمان شێوە لە وتاری دووەمی لە کاتی پێویست بەچەند وشەیەکی پڕ مانا، ماناکانی (محمدٌ رسول الله) لە دڵی هەڤاڵاندا زیندوو کردەوە، کە راستە پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم) مردووە، بەڵام سوننەتەکەی ماوە و نابێ بە هیچ شێوەیەك پشتگوێ بخرێت.
بەمە گەورەیی ئەم مرۆڤە ـ أبوبکر الصدیق رضي الله عنه ـ بۆمان دەردەکەوێت، کە پەروەردەی دەستی پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم)، وەماناکانی فەرمودەی پێغەمبەر

(١) ينظر: أبو بكر الصديق لعبد الستار الشيخ ص\٤٩٥.

(صلى الله عليه وسلم) بۆمان روون دەبێتەوە كە دەفەرموویێت: ((أرحم أمتي بأمتي أبو بكر))[1] واتە: (بەرەحمترین كەس لە ئوممەتی ئیسلام كە رەحم بە موسلمانان بكات أبو بكرە).

پوختەی ئەم مانایانەش ئەوەیە كە ئیسلام دینی: (لا إله إلا الله محمد رسول الله)یە، وەدینی رەحمەتە: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ﴾[2] واتە: مەبەست لە ناردنمان بۆ تۆ ئەی محمد وەكو پەیامبەر بۆ هەموو جیهان، تەنها رەحمەت باراندنە بەسەر جیهاندا ).

* رەحمەتباراندنێك كە رزگاركردنی مرۆڤاتییە لە بەندایەتی بەندەكان بۆ بەندایەتی (خالق) كە مانای (لا إله إلا الله)یە.

* وە رەحمەتباراندنێك كە فێركردنی مرۆڤە بە چۆنیەتی بەندایەتی كردنی (خالق) كەمانای (محمد رسول الله)یە.

كەواتە أبو بكر (رضي الله عنه) یەكەم ماموستا بوو پاش پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم )، كە ماناكانی (لا إله إلا الله محمد رسول الله)ـی لەناو ئوممەت دا زیندووبكاتەوە، بە جیهان رابگەیێنێ، بەم دوو رووداوانەی كە باسمان كردن.

وەهەروەها بەم دوو رووداوەی باسمان كردن بۆمان دەردەكەوێت، كە هەڤاڵان (رضي الله عنهم)خاوەن خاوێنترین دڵ و دەروونن، چونكە كاتێ گوێبیستی راستی دەبن پشت لە هەموو بۆچوونێكی خۆیان دەكەن بۆ ئەم راستییە، وە دوورن لە هەموو سیفەتەكانی خۆ بەگەورە زانین، چونكە پیاوی گەورەن.

---

(١) أخرجه أحمد ٢٠\٢٥٢، ٢٥٣ و ٢١\٤٠٦ ط المؤسسة.

(٢) (الأنبياء١٠٧).

# دیارخستنی چەند لایەنێکی شاراوە لە کەسایەتی پێغەمبەرمان ( صلی الله علیه وسلم )

پێغەمبەرمان(صلی الله علیه وسلم) تاکە مرۆڤە کە ژیانەکەی بە کاتژمێر و رۆژ و مانگ و ساڵ تۆمار کرابێ، ئەمەش ڕەحمەتێکی خودابیە تاوەکو مرۆڤ لە هەر بارێکی ژیاندا بێت، وە لە هەر ڕۆژگارێك دابێ، وە لە هەرشوێنێك بیت، بزانێت کەسێك هەیە کە شوێنکەوتنی ئەو کەسە چارەی گرفتەکانی ژیانە، وە دەرمانی نەخۆشییەکانی ڕۆژگارە، وە ئاسودەییە بو ئەو شوێنەی کە لێی ئەژێ.

بەڵام ئەوەی جێی تێبینییە زۆر لاپەڕەی تۆمارکراوی ژیانی ئەم پێغەمبەرە (صلی الله علیەوسلم) موسڵمانان لێی بێ ئاگان، سەرەرای ئەوەی کە گوێبیستی بوون یان خوێندیتیانەوە! لە بەر چەند هۆکارێك لەوانە:

١ ـ کەم تەرخەمی لە تێروانینمان بو ژیاننامەی پیغەمبەر (صلی الله علیه وسلم).

ئەمەش کاتێك کە تێروانینمان بۆ ژیاننامەی پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم)، وەکو تێڕوانینمان بێ بۆ ژیاننامەی هەر کەسایەتیەك، کە خزمەتی مرۆڤایەتی کردووە!. واتە بەو روحییەتەوە لەسەر ژیاننامەی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) نەوەستاوین کە بڵێین: ڕێگامان شوێنکەوتنی ئەم مرۆڤەیە لە ژیانماندا، چونکە نمونەی باڵاترین پلەی مرۆڤایەتی مرۆڤە و خاوەنی لوتکەی بەندایەتییە بۆ پەروەردگار کە پێغەمبەرایەتییە.

٢ ـ زیادە ڕەوی کردن لە تێروانینمان بۆ ژیاننامەی ئەم پیغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم).

ئەمەش لە کاتێکدا دەبێت کە مەبەستمان لە گوێبیستی ژیاننامەی ئەم پێغەمبەرە(صلی الله علیه وسلم)، یان خوێندنەوە و نووسینی ژیاننامەی ئەم پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم)، تەنها ئەوە بێت کە مەدح بکرێت!، ئەگەر نا ئەوا کەس پێی ناکریت

وەکو ئەو بکات، لە کارو کردەوەی بەندایەتیدا بۆ خودا، یان بە ئەرکی ئەو هەڵسێت بە بانگەواز بۆ ڕێگای خودا، چونکە ئەو موعجیزاتی هەیە!!. ئەمەش هەڵەیەکی گەورەیە. هۆکارەکەی جیاوازی نەکردنە لە نێوان ئەرکی شوێنکەوتن و نامومکنی وەکو یەك بوون.

بە واتایەکی نزیکتر: کاتێك نوێژی تاکی موسڵمان وەکو نوێژی پێغەمبەربێ(صلی الله علیه وسلم)، مانای ئەوە نییە کە کەسایەتی ئەو موسڵمانە وەکو کەسایەتی پێغەمبەرە(صلی الله علیه وسلم)، چونکە: **یەکەم** لە بابەتی: ((صلوا کما رأیتمونی أصلی))[١] واتە: (چۆن نوێژم کردووە ئێوەش بە هەمان شێوە نوێژ بکەن) وە **دووەم** لەبابەتی: ﴿لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا﴾[٢] واتە: (ئەرکەکانی دینداری هەر تاکەکەسێك لە توانای ئەو تاکە کەسەن).

ئەم دوو خاڵەش دژ نین بە یەکتر، بەڵکو تەواو کەری یەکترن، یەکەمیان ئەنجامدانی شوێنکەوتنە کە ئەرکی موسڵمانە، وە دووەمیان: تەواوکاری شوێنکەوتنەکەیە بە پێی توانا.

قۆناغەکانی کاروانی بەندایەتی موسڵمان بۆ پەروەردگار بە تەواوکاری شوێنکەوتنی پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم) لە (ئیسلامەوە بەرزدەبێتەوە بۆ ئیمان، وە لە ئیمانەوە بەرزدەبێتەوە بۆ ئیحسان)، وە هەموو کات موسڵمان لە هەوڵ دایە بۆ بەرزبوونەوە بۆ پلەی ئیحسان، کە پلەی دەرچوونە لە غەفلەت و ئەو پەڕی شوێنکەوتنە بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، وە شارەزابوون لە ژیاننامەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم). بۆ ئەم مەبەستەیە، کە گەیشتنە بە پلە بەرزەکانی بەندایەتی بۆ خودا بە شوێنکەوتنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)[٣].

---

(١) (مسند الشافعي ١\٥٥).

(٢) (البقرة:٢٨٦).

(٣) ينظر: شرح حديث جبريل لشيخ الإسلام الموسوم بالإيمان الأوسط ص ٥٧٨ و ما بعده.

بۆ ئەم مەبەستە پەروەردگار شوێنکەوتنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە کارو کردەوەی بەندایەتیدا دەکاتە مەرجی ڕزگار بوونی موسلمان، کە دەفەرموویت: ﴿قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾[١] واتە: (ئەی پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ ئەو کەسانە کە خوشەویستی بۆ خودا دەنوێنن، پێیان بڵێ:

* سەلماندنی ئەم خوشەویستییە ئەوەیە کە شوێنکەوتەی پێغەمبەری خودا بن.

* وە ئەنجامی ئەم سەلماندنەش ئەوەیە کە خودا ئێوەی خۆش دەوێت وە لە تاوانتان خۆش دەبێت، خودا لێبوردە و میهرەبانە.

بە واتایکی تر: وەدەست هێنانی لێبوردەی و میهرەبانی خودا، ڕێگایەکەی تەنها شوێنکەوتنی پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم)، ئەم شوێنکەوتنەش هەرگیز بە بێ شارەزابوون لە ژیاننامە و سوننەتەکەی ناکرێت[٢].

ئەمەش پێویستی بە ناسینی گەورەیی کەسایەتی ئەم پیاوەیە (صلی الله علیه وسلم)، بۆیە لەم بابەتەدا تەنها (سێ ـ ٣ ـ )خاڵ لە لایەنە نادیارەکانی کەسایەتی ئەم مرۆڤە پایە بەرزە دەخەینە بەر چاوی خوێنەر، نەك تەنها بو ئەوەی بیخوێنێتەوە، بەڵکو بۆ ئەوەی لەگەڵیدا بژێت، تاوەکو زیاتر ڕێزی ئەم مرۆڤە پایەبەرزە (صلی الله علیه وسلم) لە دڵیدا هەڵقوولێت، وە زیاتر شوێنکەوتەی سوننەتەکانی بێ لە ژیانیدا.

---

(١) (آل عمران :٣١).

(٢) ينظر: تفسير الآية عند ابن كثير في تفسيره.

## خاڵی یەكەم:

## ئارامی و لە سەرەخۆیی، كاتی دیتنی دیمەنی سەر سۆڕهێنەر

## (السكون عند روعة الروح، حال رؤية المشهد المذهل)

كاتێك لە (میعراج) دا ئەم مرۆڤە بەرزكرایەوە بۆ ئاسمانان، وە گەورەیی دیمەنی ئاسمانان و (سدرة المنتهى)ی بینی، كە بە هەندێك ڕەنگ داپۆشرابوو كە لەدونیادا ئەم ڕەنگانە نەناسراون!.

تەنانەت بۆ بەرزاییەك بەرزكرایەوە كە گوێبیستی دەنگی قەلەمەكان بووە، كە (قەدەر)یان دەنووسی!.

بەڵكو بە دڵی پاكی خۆی خودای بینی ـ نەك بە چاو[1]

لەم شوێنە بەرز و سەرسوڕهێنەرەدا، خودای پەروەردگار وەسفی دەكات بە: ﴿مَا زَاغَ ٱلْبَصَرُ وَمَا طَغَىٰ﴾[2] واتە: ئەوەندە هێمنانە و لە سەرەخۆبووە، لەو جێیە سەرسوڕهێنەرە وەكو ئەدەبێك بەرامبەر خودای پەروەردگار كە تەنها تەماشای جێی سەجدەی خۆی كردووە و ئاوڕی نەداوە بە هیچ لایەك دا[3].

لێرەدا زیاتر گەورەیی ئەم مرۆڤەمان دێتە بەرچاو، كاتێ بەراوردی بكەی بە پێغەمبەر(موسى ـ علیه السلام ـ) لە ئایەتی (١٤٣)ی سوورەتی (الأعراف): ﴿وَلَمَّا جَآءَ مُوسَىٰ لِمِيقَٰتِنَا وَكَلَّمَهُۥ رَبُّهُۥ قَالَ رَبِّ أَرِنِىٓ أَنظُرْ إِلَيْكَ ۚ قَالَ لَن تَرَىٰنِى وَلَٰكِنِ ٱنظُرْ إِلَى ٱلْجَبَلِ فَإِنِ ٱسْتَقَرَّ مَكَانَهُۥ فَسَوْفَ تَرَىٰنِى ۚ فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُۥ دَكًّا وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقًا ۚ فَلَمَّآ أَفَاقَ قَالَ سُبْحَٰنَكَ تُبْتُ إِلَيْكَ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ واتە: كاتێك موسى(علیه السلام) داوای بینینی

---

(١) ينظر: السيرة النبوية في ضوء المصادر الأصلية ١\٢٧٢ـ٢٧٣.

(٢) (النجم:١٧).

(٣) ينظر: مدارج السالكين ـ منزلة الأدب.





خودای کرد به چاو، خودای پەروەردگار پێی فەرموو مرۆڤ ناتوانن له دونیا به چاو ببینن، وه بۆ ئەوەی زیاتر ئاشنا ببی لەگەڵ گەورەیی من بڕوانە ئەم چیایە، کاتێ خۆم پیشانی ئەدەم چی بەسەردێ؟ کاتێ خودای پەروەردگار خۆی دیار ئەکات بۆ چیایەکە، چیایەکە دەڕمێ (موسی ـ علیه السلام ـ) کاتێ دیمەنی ئەم چیایە دەبینێ، له هۆش خۆی ئەچێ له بەر گەورەیی دیمەنەکە، وەکاتێ دێتەو هۆش خۆی ستایشی خودا دەکات و داوای لێخۆشبوونی لێدەکات و دەست پێشخەری خۆی ئەنوێنێ بۆ بەجێگەیاندنی فەرمانەمانی خودای پەروەردگارە.

جێی شاهید: بەراورد کردنه له نێوان کەسایەتی (محمد) صلی الله علیه وسلم و کەسایەتی (موسی) علیه السلام که له (أولوالعزم)ە!. (موسی) علیه السلام به دیتنی دارمانی چیایەك له هۆش خۆ دەچێت له بەر هەست کردن به گەورەیی خودا، بەڵام (محمد) صلی الله علیه وسلم بەدیتنی چەندین دیمەنی گەورەتر له ئاسمانان، و لەگەڵ زیاتر هەست کردن به گەورەیی خودا، زۆر ئارام و له سەرەخۆبووە، وه له ئەوپەڕی هۆش و جوانی ئەدەبدابووە. وه هەر لەم بارەیەوە، زانایانمان لەوەڵامی ئەوەی که خەڵکانێك پاش بەرەبابی هەڤاڵانی پێغەمبەرمان(صلی الله علیه وسلم)، له کاتی گوێبیستنیان له قورئان مردوون له هەژمەتا! کەچی ئەمە له بەرەبابی هەڤاڵانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) روونەداوە؟ ئەفەرمێن: حاڵی هەڤاڵانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وەکو حاڵی پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم)، که بریتییە له هەستکردن بەگەورەیی خودا وه خۆڕاگری، کەچی بەرەبابی پاش ئەوان حاڵیان وەکو حالی (موسی ـ علیه السلام ـ)ە، که بریتییە له هەستکردنە به گەورەی خودا، بەڵام به بێ خۆڕاگری!.

کەواتە بەتێڕوانینێکی ورد بۆمان دەردەکەوێت که کەسایەتی پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم) بەرزترە له کەسایەتی موسی(علیه السلام)، وه کەسایەتی هەڤاڵانی پێغەمبەرمان بەرزترە له کەسایەتی بەرەبابی پاش ئەوان(تابعین)! [١].

---

(١) ينظر: مجموعة الفتاوى ١١\١٣ومدارج السالكين ج٢ ص ٤٨٢ـ٤٨٥ ط الرشد، طريق الهجرتين ١\٣٢٣ ط٢ القاهرة.

## خاڵی دووەم :

## ئارامی و لەسەرە خۆیی لە کاتی ئازاری جەستە لە بەر سەختی لێدان

## ( السكون عند الم الجسد من شدة الضرب )

بەکارهێنانی ئازاری جەستەیی لە مەککە دژی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) یەکێك بوو لەو بەربەستانەی کە گاورەکانی مەککە بەرامبەر بانگەوازی ئیسلامەتی بەکاریان دەهێنا، وە بە چاو پێخشاندنێك لە ڕۆژگاری بانگەواز لە مەککە ئەم ئەشکەنجەدانە چەندین جار دێتە بەر چاومان، لێرەدا ئەوەی پەیوەندی بە بابەتەکەمانەوە هەیە زانینی هەڵسوکەوتی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم) بەرامبەر ئەم ئەشکەنجەدانە، ئایا چی بووە؟ یان چۆن بووە؟. تاوەکو وەڵامەکە تیشکێك بخاتە سەر لایەنە بەزرەکانی ئەم کەسایەتیە ـ محمد صلى الله عليه وسلم ـ با ئەم وەڵامە لە زاری گاورەکانی مەککە گوێبیست بین، لە ڕۆژگاری کۆچکردنی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بۆ مەدینە.

کاتێ پێغەمبەر ماڵی خۆی بەجێ ئەهێلێ، فەرمان بە ئیمامی علی (رضي الله عنه) دەکات، کە لە شوێنی ئەو بخەوێت و گشت جەستەی داپۆشێت، ئیمام علی (رضي الله عنه) فەرمانە ترسناکەکەی بە بێ دوو دڵی بەجێ ئەگەێنی، کاتێ کافرەکان بۆ کوشتنی محمد (صلى الله عليه وسلم) دێن، یەکەم جار بەردی تێدەگرن تاوەکو ببینن ئەوجا بیکوژن، وە کاتێ لە دوورەوە چەند بەردێکی تێ دەگرن، لەگەڵ بەرکەوتنی هەر بەردێك بە جەستەی ئیمامی علی (رضي الله عنه) لەگەڵ ئازارەکەدا جوولەیەك دەکات، وەکو ئەنجامێکی سروشتی ئازارەکە، بە دیتنی گاورەکان بۆ جولانەوەی ئیمامی علی (رضي الله عنه) لەگەڵ هەر لێدانێك، کافرەکان دوو دل دەبن دەزانن ئەوی ناو جێگاکە محمد (صلى الله عليه وسلم) نییە! چونکە دە یانزانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە کاتی لێدان و ئازاردانی جەستەیی جوولەی نە ئەکرد، بۆیە علی (رضي لله عنه) لە ناو جێگا دەر دێنن وە پێی

ئەڵێن: (إنك للئيم كان صاحبك نرميه فلا يتضور، و أنت تتضور و قد استنكرنا ذلك )[1]

واتە: تۆ پیاوی باش نی، زانیمان تو (محمد) نیت، چونکە ئەو لە کاتی ئازارداندا جوولەی نە ئەکرد، بەڵام تۆ خۆت لوول ئەدا و جوولەت دەکرد، بۆیە زانیمان ئەوەی ناو جێگا (محمد)نییە.

جێی شاهید لەم بەسەرهاتە: توانا روحییەکانی ئەم مرۆڤە محمد (صلی الله علیه وسلم)، کە وای لێ ئەکرد لە کاتی گەورەترین ئازارەکانی جەستەیدا ؛ وەڵامی دوژمنی خۆی بداتەوە بە ئارام گرتنێکی ئەوتو کە هیچ جولەیەکی لەگەڵ نەبێ!.

نهێنییەکەش لەوەدایە کە هێزە دەروونیەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و توانا روحیەکانی زاڵن بەسەر ئازارەکانی جەستە، هەر بۆیەش کاتێ دوژمنانی لەو پەڕی هێزو ستەمکاری دا بوون دژی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، نەیان توانیوە هەست بەوەبکەن کە (محمد ـ صلی الله علیه وسلم ـ ) لاواز و بێدەسەڵاتە بەرامبەریان، بەڵکو بەردەوام ترسی ئەم کەسە لە ناو دڵیاندابووە، هەستیان کردووە کە ئارامی و بێدەنگی ئەم کەسە بەرامبەر ئازارو ئەشکەنجەدان لە هێزو ستەمکاریان زیاترە.

﴿ وَٱجْعَل لِّي لِسَانَ صِدْقٍ فِي ٱلْأَخِرِينَ ﴾ شورى :٨٤

---

(١) مسند أحمد ١١٩\٢٣ الفتح الرباني ـ والتضور: التلوي و التقلب ظهراً لبطن.

## خاڵی سێیەم:

## ئارامی و لەسەرخۆیی لە کاتی ترسانی دڵ لە کوشتن

### (السكون عند خوف القلب من القتل)

لە ڕۆژگارێکدا لە ڕێی کوچکردن بۆ (مەدینە)، پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) هەموو هوکارێکی گرتبووە بەر تاوەکو بەسەرکەوتوویی لە دەست تۆقاندنی خەڵکی شارەکەی خۆی (مەککە) رزگارببێت، بەڵام چەکی هەڵنەگرتبوو! چونکە لە قۆناغی مەککی بانگەوازی ئیسلام خودا فەرمانی نەدابوو بە چەك هەڵگرتن، بەڵکو تەنها خۆپاراستن بە شێوازی جۆراو جۆر و ئارام گرتن لەسەر هەموو لێدان و تۆقاندنێك، لە پێناوی ئەوەی کە بەیانی حەق بکرێت ، وە دوژمنەکانیان لە ئاگری دۆزەخ ڕزگاربکەن بە ئاشناکردنیان بە ئیسلام!!.

ئەم بێ چەکییە لە ڕێی کۆچکردندا مەترسیداربوو، وە ئەوەی جێی مەترسی بوو ڕوویدا، کاتێ (سراقة بن مالك المدلجي) خۆی پڕچەك کرد بۆ کوشتنیان لە پێناو پاداشتێك کە سەرانی مەککە ڕایانگەیاندبوو، بو ئەو کەسەی کە محمد (صلى الله عليه وسلم) یان أبو بكر (رضي الله عنه) بە مردوویی یان زیندوویی تەسلیمیان بکات.

سوراقە توانی ڕێی پیغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و هەڤاڵەکەی بزانێ، وە توانی لێیان نزیك ببێتەوە تا وەکو نێوان ئەو و ئاواتەکەی کە کوشتنی ئەم دوو کەسەیە یان گرتنیانە چەند چرکەێك مابوو. لە باسی ئەم بارە ترسناکەی سەر پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و هەڤاڵەکەی أبو بکر (رضي الله عنه)، سوراقە - پاش موسڵمان بونی - دەفەرمووێت:

(تقرب بي - أي فرسي - حتى إذا سمعت قراءة رسول الله صلى الله عليه وسلم و هو لا يلتفت و أبوبكر يكثر الإلتفات!)



واتە: زۆر لێیان نزیك بوومەوە بە ئەسپەکەمەوە پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) یادی خودای دەکرد و زۆر بەئارامی دە ڕۆیشت و ئاوڕی نەدەدایەوە، بەڵام أبو بكر (رضي الله عنه) زۆر ئاوڕی دەداوە و شەپرزە بوو.

وە هەروەها أبو بكر باس لە هەمان ڕووداو دەکات: کە گریاوە لە ترسی ئەوەی پێغەمبەر(صلی الله علیە وسلم) بکوژرێت، دەفەرمووێت: پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) لەو کاتە سەختەدا بە منی فەرموو: بو دەگرییی ! خودا پارێزگاریمان دەکات.

جێی شاهید: ئەوە نییە بەسەرهاتی ڕزگاربوونیان باس بکەین وەك لە زۆرینەی پەرتووکەکانی فەرمووده و ژیاننامەی پێغەمبەردا هاتووە[١]، بەڵکو مەبەستمان تەنها ڕاوەستانێکی هزرە لەسەر تواناى کەسایەتی ئەم پێغەمبەرە (صلی الله علیە وسلم)، لەو کاتانەی کە لە نزیك خۆی بە هەموو پێوەرێکی ژیری مردن ئەبینیٚ، بەڵام چەند ئارام و لەسەرەخوبووە!؟ تەنانەت ڕێی بە خۆنەداوە ئاوڕیش بداتەوە لە دوژمنەکەی کە هەولی کوشتنی دەدات ! ئەمە جێی بیرکردنەوەیە لە کەسایەتی ئەم مروڤە پایە بەرزە (صلی الله علیە وسلم).

ئەم سێ خالەی باسمانکردن جێی ئەوەن مرۆڤ زۆر بیریان لێ بکاتەوە، تاوەکو بزانێ کە هەموو کەسایەتییەکی گەورە بە بەراوردکردنی لەگەڵ کەسایەتی پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) بچووك ئەبێتەوە، وە تەنها محمد (صلی الله علیە وسلم) شیاوە کە نمونەی مرۆڤی کامل بێ بۆ گشت مرۆڤایەتی، ئەمە وەکو مرۆڤ، ئەی ئەگەر سەرەرای مرۆڤایەتییەکەی پێغەمبەریش بێ!.

(١) ينظر: البخاري ٣٩٠٦ ، ٣٦١٥ و السيرة النبوية لصوياني ١\٢٦٨ ـ ٢٧٠.

﴿لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُواْ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْآخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا﴾ (١)

**واتە: ئەی ئەوکەسەی رازیبوونی خودات مەبەستە و ئاواتت رزگاربوونە لە رۆژی قیامەت چاکترین نمونە کە شوێنی بکەوی بۆ بەدیهێنانی ئەم مەبەست و ئاواتە تەنها کەسایەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و پەیامەکەیەتی.**

﴿وَقُل رَّبِّ أَدْخِلْنِي مُدْخَلَ صِدْقٍ وَأَخْرِجْنِي مُخْرَجَ صِدْقٍ وَٱجْعَل لِّي مِن لَّدُنكَ سُلْطَٰنًا نَّصِيرًا﴾

الإسراء: ٨٠



(١) (الأحزاب: ٢١).

# پرسیار و وەڵامی A و B

ئەم بابەتەی گۆڤاری (ئەیووبی) تایبەتە بە پرسیار و وەڵام، وە لە دوو بەش پێك دێت:

یەکەمین: تایبەت بە حەڵاڵ و حەرام وەکو لە پەرتووکە فیقهییەکاندا هاتووە.

دووەمین: پرسیار و وەڵامی گشتی لە بابەتە جیاجیاکانی ئایین.

## بەشی یەکەم

## پرسیار و وەڵامی فیقهی

لەم بەشەدا بە پێی ڕیزبەندی بابەتەکانی پەرتووکی (بلوغ المرام من أدلة الأحكام) پرسیار و وەڵامەکان ئامادەکراون. وە پەرتووکی (بلوغ المرام من أدلة الأحكام) زانای ناودار (ابن حجر ـ رحمه الله ـ) کۆی کردووتەوە لە فەرموودەی پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) کە تایبەتن بە (حەڵاڵ) و (حەرام)، لە بابەتەکانی پاکژی (الطهارة)دا دەست پێدەکات بۆ بابەتەکانی سەربەست کردن (العتق)، پاشان بە بابەتێکی گشتگری ئاداب و زکر ودوعا کوتایی دێت.

وە لەم ژمارەی گۆڤارەکەمان بە بابەتە یەکەمەکانی پاگژی:

١ ـ جۆرەکانی ئاو (المياه).

٢ ـ قاپ و قاچاخ (الآنية).

دەست پێدەکەین بە پشتیوانی خودا.

تێبینی: لە ئامادەکردنی پرسیار و وەڵام سەباردت گشت بابەتەکانی (بلوغ المرام) ڕەچاوی ئەم خاڵانە دەکەین:

١ ـ کورتی و پوختی لە پرسیار و وەڵامەکەی.

٢ ـ نووسینەوەی بەڵگەکانی وەڵامەکە، بەبێ وەرگێڕان بۆ زمانی کوردی. چونکە ئەوەی ئارەزووی زانینی بەڵگە و لێکدانەوە هەیە پێویستە خۆی لە زمانی عەرەبی شارەزا بکات.

٣ ـ ئەگەر زانیمان جێی شاهید لە بەڵگەکە بۆ وەڵامەکە نادیارە، ئەوا ئاماژەی بۆ دەکەین، بە پشتیوانی خودا.

٤ ـ ئەگەر پرسیار و وەڵامە ئامادەکراوەکە سەبارەت بە (النوازل ـ شتی نوێ ـ ) بێ، ئەوا ئاماژە بۆ سەرچاوەی وەڵامەکە دەکەین.

لە کۆتاییدا داوا لە خودای پاك و بەخشندە دەکەین، کە بمان پارێزێت لە دەرچوون لە راستی تێگەیشتنی بەڵگەکان و یەك رای زانایان، وە نییەتمان خاوێن بکات، و توانامان پێ ببەخشێ، تاوەکو ئەم بابەتانە بە جوانترین شێوە و بە ئاسانترین رێگا لە خوێنەرانی ئەم گۆڤارە نزیك بکەین.

## بابەتی یەکەم

## جۆرەکانی ئاو

پرسیاری یەکەم:

ئایا دەتوانین هەموو ئاوێك بۆ دەست نوێژ و غوسل بەکاربهێنین؟

وەڵام:

ئاو دوو بەشە: خاوێن و پیس، وە هەموو ئاوێك خاوێنە، بێجگە لەو ئاوەی کە **رەنگی یان تامی یان بۆنی** گۆڕابێ، بەمەرجێك گۆڕانەکە لە بەر ئەوە بێت کە شتێکی پیس چووبێتە ناوی، وە هەر ئاوێك خاوێن بێ بۆ دەست نوێژ گرتن و غوسل هەڵگرتن دەشێ.

[illegible]

١ ـ عن أبي سعيد الخُدري رضي الله عنه قال قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (([illegible]

[illegible]

٢ ـ عن أبي أمامة الباهلي رضي الله عنه قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (([illegible]

[illegible] شيء إلا ما غلب على ريحه و طعمه و لونه [illegible] إن تغير

ريحه و طعمه [illegible] تحدث فيه

※ و أجمع علماء الإسلام على صحة معنى حديث أبي أمامة، وممن نقل الإجماع على ذلك:

الشافعي و ابن منذر و غيرهما

[illegible]

[illegible]

[illegible]

بەڵێ دەتوانین! بەڵام بەمەرجێك ناوی ئاوی لەسەر مابێ، بۆ نمونە ناتوانی بە شەربەت یان چای دەست نوێژ بگرین هەرچەندە خاوێنن، چونکە ناوی ئاویان لەسەر نەماوە، بەڵام کاتێ ـ بونمونە ـ ئاوێك سوێربوو لەبەر خوێ یان ڕەنگی گۆڕابوو لەبەر گەڵای دار، ئەوا چونکە ناوی ئاوی لەسەر ماوە با ڕەنگی یان بۆنی یان تامی گۆڕابێ دەتوانین غوسل و دەست نوێژی پێ هەڵکرین. چونکە گۆڕانی ئاوەکە لەبەر شتێکی خاوێن ڕوویداوە، کە خوێیە سوێری کردووە، یان گەڵای دارە کە ڕەنگەکەی گۆڕیوە، وە لە هەمان کاتدا ناوی ئاوی هەر لەسەر ماوە و گۆڕانەکە ناوێکی تری بە ئاوەکە نەبەخشیوە.

---

(١) أخرجه الثلاثة و صححه أحمد.

(٢) أخرجه ابن ماجه و ضعفه أبو حاتم و للبيهقي.

(٣) ينظر: منحة العلام شرح بلوغ المرام ١\٣٣ ـ ٣٤ .

بەڵگە:

١ ـ عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم في البحر: ((هو الطهور ماؤه الحل ميتته))[1].

٢ ـ و عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: ((إذا وقع الذباب في شراب أحدكم فليغمسه ثم لينزعه، فإن في أحد جناحيه داء وفي الآخر شفاء))[2] وزاد:

((وإنه يتقي بجناحه الذي فيه الداء)).

* محل الشاهد: ما لا دم له سائل فهو طاهر لا ينجس الماء به.

٣ ـ و عن أبي واقدٍ الليثي رضي الله تعالى عنه قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: ((ما قطع من البهيمة وهي حية فهو ميت))[3].

* محل الشاهد: إن ماله دم سائل إذا مات فهو نجس يؤثر في الماء.

پرسیاری سێ یەم:

ئایا کەم وزۆری ئەو کاری هەیە بە سەر پیس بوون و خاوێنی ئاوەکە؟

وەڵام:

**بەڵێ! چەند ئاو زۆربێ زیاتر خاوێنی خۆی دەپارێزێ، وە هەرچەندە کەم بێت کەمتر خاوێنی خۆی دەپارێزێ. وە ئاوی کەم، لەوانەیە بە پیسی یەکی کەم خاوێنــی خۆی لە دەست بدات، واتە ڕەنگی یان بۆنی یان تامی بگۆڕێت، بەڵام ئاوی زۆر خاوێنی خۆی**

---

(١) أخرجه الأربعة و ابن أبي شيبة و اللفظ له و صححه ابن خزيمة والترمذي وورواه مالك و الشافعي واحمد.

(٢) أخرجه البخاري و أبوداود.

(٣) أخرجه أبو داود و الترمذي و حسنه و اللفظ له.

بپارێزێت بەرامبەر گەورەترین پیسایی، واتە پیسایی کار نەکاتە سەر گۆڕینی ڕەنگ و تام و بۆنەکەی.

لە هەمان کاتدا ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە پەند لە پیسبوون بۆ کەم و زۆری ئاو بگەڕێتەوە، بەڵکو پیس بوونی ئاو **تەنها پەیوەندی بەوە وە هەیە کە بە هۆی نجاسەوە ـ پیسی ـ یەکێك سێ سیفەتەکانی (ڕەنگ، بۆن، تام) لە دەست بدات.**

بەڵگە:

**١ ـ عن عبد الله بن عمر (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم:** ((إذا كان الماء قلتين لم يحمل الخبث)) **و في لفظٍ:** ((لم ينجس)) [1].

*** محل الشاهد في الحديث: أن الماء الكثير ـ نحو ٢٠٠ لتر فما فوق ـ لها مقاومة أكثر لدفع النجاسة من الماء القليل و هي دون ذلك، و أخذ الأكثر بمفهوم الحديث وقالوا: مادون القلتين ينجس بمجرد ملاقات النجاسة. و الراجح الأول**

**٢ ـ عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم:** ((طهور إناء أحدكم إذا ولغ فيه الكلب أن يغسله سبع مرات أولاهن بتراب)) **أخرجه مسلم و في لفظٍ له** ((فليرقه)) **و لترمذيٍّ:** ((أخراهنّ))**أو** ((أولاهنّ))**.**

*** محل الشاهد في حديث أن يسير الماء ـ دون القلتين ـ ينجس بمجرد ملاقات النجاسة. و جواب ذلك: خصوصية الحديث بالكلب و ان الغسل سبعاً أقرب إلى التعبد.**

**٣ ـ و عن أبي قتادة (رضي الله عنه) أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال في الهرة:** ((إنها ليست بنجس إنما هي من الطوافين عليكم)) [2].

---

(١) أخرجه الأربعة و صححه ابن خزيمة و الحاكم و ابن حبان.

(٢) أخرجه الأربعة و صححه الترمذي و ابن خزيمه.

* فائدة: لم يذكر الحافظ حديث الكلب و الهرة في باب النجاسات وبينها، و إنما ذكرهما في باب المياه مع حديث الذباب و حديث ما قطع من البهيمة، كل ذلك لبيان قول الأكثر في الأخذ بمفهوم حديث القلتين و هذا من فقهه و رغم ذلك أكثر شراح بلوغ المرام يغفلون عن ذلك!.

پرسیاری چواردەم:

ئایا ئاوی پەنگاو(دائم) جیاوازی هەیە لەگەڵ ئاوی جۆگەکان (جاري) لە رووی پاراستنی پاکژییەکەی؟

وەڵام:

بەڵێ ئاوی پەنگاو ئەگەر پیسایی بچێتە ناوی زیاتر شیاوە بۆ پیسبوون لە ئاوی جۆگاکان، بۆیەش پێویستە زیاتر بپارێزرێت.

بەڵگە:

١ ـ عن أبي هريرة رضي الله عنه قال قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: ((لا يغتسل أحدكم في الماء الدائم و هو جنب))[1].

و للبخاري: ((لا يبولنَّ أحدكم في الماء الدائم الذي لا يجري ثم يغتسل فيه)). و لمسلمٍ:((منه))

و لأبي داود: ((و لا يغتسل فيه من الجنابة)).

پرسیاری پێنجەم:

ئاوێک پاشماوەی کەسێکە کە غوسلی جەنابەتی پێ هەڵگرتووە، ئایا دەتوانین بۆ جارێکی تر بەکار بیهێنین بۆ غوسل هەڵگرتن یان دەست نوێژ کرتن؟

وەڵام:

بەڵێ دەتوانی بەڵام ئەگەر ئاوی تر هەبێ، ئەوا باش نییە (مەکروهە) بەکاری بێنی.

---

(١) أخرجه مسلم.

## بابەتی دووەم

## قاپ و قاچاخ

پرسیاری یەکەم:

ئایا دەتوانین لە بەر (حەنەفی) لە زێڕ یان زیو دروستکراو یان بە زێڕ یان زیو ... دەست نوێژ بگرین؟

وەڵام:

**ناتوانین، بەڵام ئەوە ناگەیەنێت کە دەست نوێژەکە تەواونییە.**

بەڵگە:

**عن حذيفة بن اليمان (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم:** ((لا تشربوا في آنية الذهب و الفضة ولا تأكلوا في صحافها فإنها لهم في الدنيا ولكم في الآخرة))[1].

**و عن أم سلمة (رضي الله عنها) قالت: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم:** ((الذي يشرب في إناء الفضة إنما يجرجر في بطنه نار جهنم))[2].

**و عن أنس بن مالك (رضي الله عنه):** ((أن قدح النبي صلى الله عليه وسلم انكسر فاتخذ مكان الشعب سلسلة من فضة))[3].

**※ محل الشاهد: أن علة الحكم سد ذرائع التكبر، و الوضوء أولى من الأكل في هذا الباب.**

**أما استعمال يسير الفضة للحاجة ليس فيه تلك العلة فجاز كما في حديث أنس (رضي الله عنه).**

---

(1) متفقٌ عليه.

(2) متفقٌ عليه.

(3) أخرجه البخاري.



فائدة:

ذكر الذهبي في السير (٢٨٧/٢١): أن صلاح الدين الأيوبي ـ رحمه الله ـ أنكر تحلية دواته بفضةٍ. ثم علق على ذلك قائلاً: في جوازه وجهٌ ذكره أبو محمد الجويني.

و يدل لهذا الوجه أن أم سلمة (رضي الله عنها) وهي راوية حديث النهي عن الشرب في آنية الفضة، كانت لها جلجل من فضة فيه شعرات من شعر النبي صلى الله عليه وسلم [1]

پرسیاری دووەم:

ئایا پێستی گیانداری مردارەوەبوو بە دیباغ خاوێن دەبێتەوە؟

وەڵام:

**بەڵێ، بەمەرجێك گیاندارەکە لەو گیاندارانەبێ کە گۆشتیان حەڵاڵە.**

بەڵگە:

عن ابن عباسٍ (رضي الله عنهما) قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: ((إذا دبغ الإهاب فقد طهر)) [2]. و عند الأربعة ((أيما إهاب دبغ)).

و عن سلمة بن المحبق (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: ((دباغ جلود الميتة طهورها)) [3].

و عن ميمونة (رضي الله عنها) قالت: مرَّ رسول الله (صلى الله عليه وسلم) بشاة يجرونها فقال: ((لو أخذتم إهابها؟)) فقالوا: إنها ميتةٌ فقال: ((يطهرها الماء والقرظ)) [4].

---

(١) ينظر: فتاوى العثيمين ٩١\١١.

(٢) أخرجه مسلم.

(٣) صححه ابن حبان.

(٤) أخرجه أبو داود والنسائي.

ڕاستەراست:

ما عزاه الحافظ لسلمة بن المحبق (رضي الله عنه) وهمٌ و الصحيح أن الحديث بهذا اللفظ لعائشة (رضي الله عنها). (ينظر: الإحسان بترتيب صحيح ابن حبان رقم: ١٢٩٠) و لفظ حديث سلمة بن المحبق (رضي الله عنه): ((زكاة الأديم دباغه)) (الإحسان ٤٥٢٢).

ومحل الشاهد للجواب: لفظ: ((زكاة ـ في حديث ابن المحبق ـ)) و وجهها: تسمية الدباغ زكاةً فما لا تحل من الحيوانات بالزكاة الشرعية ـ الذبح ـ فإن الدباغ لا يطهر جلدها إذا ماتت.

و على هذا فلا بأس على الذين يستعملون الأواني المدبوغة أن يتوضأوا منها[1].

پرسیاری سێیەم:

حوکمی بەکارهێنانی قاپ و قاچاغی کوردکان چییە؟

وەڵام:

دەتوانین بەکاریبهێنین بە مەرجێك بشورێت، ئەوەك پاشماوەی عارەق یان گۆشت بەرازی پێوەبێ.

بەڵگە:

عن أبي ثعلبة الخشني (رضي الله عنه) قال: قلت: يا رسول الله، إنا بأرض قومٍ أهل كتاب أفنأكل في آنيتهم؟ قال: ((لا تأكلوا في آنيتهم إلا أن لا تجدوا غيرها. فاغسلوها و كلوا فيها))[2]. و عن عمران ابن حصينٍ (رضي الله عنه): ((أن النبي (صلى الله عليه وسلم) و أصحابه توضؤوا من ميزادة امرأة مشركة))[3].

* الحديث الأول في بيان علة المنع، و الحديث الثاني دليل الجواز.

---

(١) ينظر: مسند احمد( ٢٠٠٦١و ٢٠٠٧١ ) و ( اختيارات شيخ الإسلام ١\٢٣٦ ـ ٢٨٨.

(٢) متفقٌ عليه.

(٣) متفقٌ عليه.

# بەشی دووەم

## پرسیار و وەلامی گشتی

لەم بەشەدا چەند پرسیار و وەلامێکی گشتی دەخەینە روو دەربارەی چەند بابەتێکی جیاواز کە پەیوندییان بە تێگەیشتنی ئیسلامەوە هەبێت، بۆ هەرکەسێك کە بیەوێت بەڕاستی لە ڕاستی ئیسلام تێ بگات و ویستی فێربوونی هەبێ بۆ ئەم ئایینە. نەك خواستی گەڕان لێرە و لەوێ بەدوای شوبهات.

هەر بۆیەش ئەو پرسیارانەی بۆ ئەم بەشە هەڵدەبژێرین بەزۆری ئەو پرسیارانەن کە لەناخی مرۆڤێکدا دەجوولێنەوە کە ئارەزوومەندە بۆ فێربوونی ئیسلام. لەم ڕۆژگارەدا کە حەق و ناحەق لە خەڵکانێکی زۆر تێکەڵ بووە بە ئاستێك کە لێك جیاکردنەوەیان ئاسان نەبێ.

هەر لە بەر ئەم مەبەستە هەوڵمان داوە بە پێی توانا وەڵامەکان ڕەوانبن، وە لە کۆتایی هەر وەڵامێك بەڵگەکان دەخەینە ڕوو، ئەگەر پێویست بکات. وە چونکە بابەتەکە پرسیار و وەڵامە سەبارەت بە بابەتی زۆر گرنگ، بۆیە هەوڵدەدەین هەندێك درێژەی پێبدەین، چونکە هەندێك شوبهە بە ڕستەیەك و دوو ڕستە لە ناو ناچن، بێجگە لەمەش ئێمە لە وڵاتێکدا دەژین کە بەردەوام کارگەکانی دروستکردنی شوبوهات لە زیادبوون دان.

هەروەها هەولدەدەین درێژییەکە بێزارکەر نەبێت، چونکە بەداخەوە لەم وڵاتە خوێندنەوە لە کارە بێزارکەرەکانە، بەڵام خوێنەریش هەیە، بۆیەش بۆ خوێنەری بەڕێز ئەگەر ویستی بە دواداچوون و لێکولینەوەی هەبێت، ئاماژە بۆ سەرچاوەکانی بابەتەکە دەکەین، داواکارین کە پەروەردگار پشت و پەنامان بێت.

پرسیاری یەکەم:

مەبەست لە بوونی چەندین مەزهەب لە یەک ئایندا چییە؟ ئایا موسڵمان لە ژیانی ڕۆژانەی خۆیدا پەرستییە پابەندە بووە دەست بە یەکێک لە مەزهەبەکانەوە بگرێت؟

وەڵام:

**مەزهەب: بریتییە لە** بیرۆ ڕای زانایانی ئیسلام لەسەر ئەو بابەتانەی کە پەیوەندییان **بە** بنچینەکانی **ئایینەوە نەبێ، کە** لای تاکی موسڵمان زانراون، وەکو واجب بوونی نوێژ و زەکات و **ڕۆژووی ڕەمەزان و حەج، وە حەرام** بوونی کوشتن و ڕیبا و زینا و تاڕەق و **ستەمکاری. ...هتد، بەڵکو پەیوەندییان بە بابەتە لاوەکییەکان** (فروع)ەوە هەیە. **کە تاکە** کەسی موسڵمان کاتێ پێویستی پێدەبێ **لە زانایەك بپرسێ کە** ناسراوە بە شارەزایی **لە** ئایین **و تەقواداری،** کە لە قورئانی پیرۆزدا بە (**أهل الذکر**) دەناسرێن، **پەروەردگار** دەفەرموێت: فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِنْ كُنْتُمْ لَا تَعْلَمُونَ [١] **واتە: کاتێك پێویستیتان بە زانستێك بێت پرسیار** لە شارەزایان بکەن.

هەروها **هیچ** بەڵگەیەکمان نییە **لە** قورئانی پیرۆزو فەرموودەی **پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)** کە تاکی موسڵمان پابەند بکات بە مەزهەبێکەوە، **بێجگە لە پابەندبوون بە** (**قورئانی** پیرۆز) و (**فەرموودەی پێغەمبەر- صلی الله علیه وسلم -**). وە زانایانمان بۆ شارەزابوونیان لە لقەکان(فروع)ـی شەریعەت، ئەگەر بە **قوتابخانەیەکی فیقهی** (مەزهەبێکەوە) خۆیان پابەند بکەن، نەك لەبەر ئەوەیە کە لە سەریان واجبە پابەند بن بەو قوتابخانە فیقهییەوە، بەڵکو کار ئاسانییەکە بۆ ئاسانی تێگەیشتن لە (قورئانی **پیرۆز**) و (فەرموودەی پێغەمبەر- صلی الله علیه وسلم -). وە ئەوەی لە سەریان واجبە تەنها ئەوەیە کە زیادەیەك نەڵێن لە دیندا، کە پێشتر نەگووترابێ یان سەرپێچی بێت بۆ گشت زانایانی

(١) (النحل:٤٣).

پێشین، ئەمە لەگەڵ پابەندبوون بە قورئانی پیرۆز و فەرموودە (صحیح)ەکانی پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم).

لەم بارەیەوە دوو کەس هەڵە دەکەن کاتێك یەکێکیان بڵێت: پابەندبوون بە مەزهەبێکەوە مەرجە بۆ تێگەیشتنی قورئان و فەرموودە، وە دەرچوون لە مەزهەب حەرامە! وە ئەوی تر بڵێت، پابەندبوون حەرامە بە مەزهەبێکەوە، بەڵکو پشت گوێخستنی قورئانی پیرۆز و فەرموودەیە !.

ڕاستی لە نێوان ئەم دوو بۆچوونە دایە، کە زانای موسڵمان تەنها پابەندە بە قورئانی پیرۆز و فەرموودەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، بەڵام بە سوود وەرگرتن لە گشت مەزهەبەکان کە ئاسانکارییان کردووە بۆ تێگەیشتن لە قورئانی پیرۆز و فەرموودەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، یان سوود وەرگرتن لە مەزهەبێك ـ قوتابخانەیەکی فیقهی ـ بۆ هەمان مەبەست، واتە: وەکو ئاسانکاری بۆ تێگەیشتن لە قورئانی پیرۆز و فەرموودەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نەك دەمارگیری بۆ سەرانی قوتابخانەکە.

هەر لەم ڕوانگەیەوە گشت سەرمەزهەبەکان، واتە ئەوانەی قوتابخانەی فیقهییان هەیە وەکو (أبو حنيفة، مالك، الليث، الشافعي، الأوزاعي، أحمد، ابن حزم. ..) یەك ڕان لەسەر ئەوەی کە بۆچوونەکانیان پشتگوێ دەخرێن ئەگەر دەرکەوت کە سەرپێچین بۆ فەرموودەی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم).

* ئیمامی (أبو حنيفة) دەفەرموێت: (إذا صح الحديث فهو مذهبي)[1] واتە: هەرکات بۆچوونی من سەرپێچی بێت بۆ فەرموودەی (صحیح)، ئەوا کار بە فەرموودەکەبکەن و فەرموودەکە بۆچوونی منە!).

---

(١) حاشية ابن عابدين ١\٦٧.

* ئیمامی (مالك) دەفەرموویّت: (إنما أنا بشر أُخطيء و أصيب، فانظروا في رأيي فكل ما وافق الكتاب و السنة فخذوه، و كل ما لم يوافق الكتاب و السنة فاتركوه)[1] واتە: (من مرۆڤم هەڵە دەکەم لە بۆچوونەکانم، بروانە بۆچوونەکانم، ئەوەی سەرپێچیبێ بۆ قورئان و فەرموودە کاری پێنەکەن).

* ئیمامی (شافعی) دەفەرموویّت: (مامن أحدٍ إلا و تذهبُ عليه سنة لرسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ و تعزب عنه، فمهما قلتُ من قول، أو أصَّلتُ من أصل، فيه عن رسول الله صلى الله عليه وسلم خلاف ما قلت، فالقول ما قال رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ، و هو قولي). واتە: (کەس نییە بە هەموو فەرموودەکانی پێغەمبەرمان ـ صلى الله عليه وسلم ـ ئاگاداربێت، بۆیە هەر قسەیەکم کردبێ یان هەر ڕێسایەکم دانابێ، سەرپێچی بێت بۆ قسەیەکی پێغەمبەرـ صلى الله عليه وسلم ـ ئەوا پشت لە قسەو ڕێساکانم بکەن وە دەست بەودوە بگرن ئەوەی پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ فەرموویەتی)[2].

دەیان زانای تر ئەم مانایانە دووبارەدەکەنەوە[3]، بنەماکانی ئاینی ئیسلام بەدرێژایی زیاتر لە چواردەسەدە خودای پەروەردگار بەم جۆرە زانایانە پاراستوویەتی، وە ئەوانەی دژایەتی ئەم زانایانە دەکەن، لە راستیدا نەفام نین، بەڵکو دوژمنی ئیسلامن و لەم ڕێیەوە دژایەتی قورئانی پیرۆز و فەرموودەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەکەن.

بەڵام ئەوەی جێی داخە، بەرامبەر ئەمانەش زیادە ڕەوییەك هەیە لە کەسانێکی دڵسوز، کە وەکو قورئان و فەرموودە دەڕوانێتە قوتابخانەیەکی فیقهی دیاریکراو کە خۆی پێی پابەند کردووە، بە بەڵگەی ئەوەی کەس موجتەهید نییە تاوەکو لە قوتابخانە فیقهیەکان دەرچێت،

---

(١) الجامع لابن عبدالبر ٢\٣٢.

(٢) رواه الحاكم كما في تأريخ دمشق ١٥\١\٣.

(٣) للمزيد ينظر: كتاب صفة صلاة النبي (صلى الله عليه وسلم) للالباني (ص١٩-٤٦ منهج الكتاب).

بۆیە پابەندبوون بە مەزهەبێکەوە ـ قوتابخانەیەکی فیقهییەوە ـ واجب دەکات لە سەر موسڵمانان، ئەمەش وەڵام دانەوەی هەڵەیە بە هەڵە وەڵامەکەشی دەستگرتنە بە (الوسطية) کە نواندنی مام ناوەندییە لە نێوان زیادەڕەوی و کەم تەرخەمی، پوختەکەشی ئەوەیە کە بڵێین:

پابەند نەبوون بەمەزهەبێکەوە تاوان نییە، وە ماناشی ئەوەنییە کە ئەگەر کەسێك خۆی بە مەزهەبێکەوە نەبەستێت ئەوا خۆی بە موجتەهید دەژمێرێت، بەڵکو مانای ئەوەیە، کە ئەوندە بیرۆ هۆش و تاردەزووی هەیە کە پرسیاری بەڵگەی حوکمی شەرعی بکات یان بە دوایدا بگەڕێت، ئەمەش زانایان بە (إجتهاد) نایژمێرن، بەڵکو بە شوێنکەوتن بۆ بەڵگە (إتباع) دەیژمێرن، ئەمە لە کاتێکدا هیچ لارییەك نییە ئەگەر موسڵمانێك تەنها پرسیاری حوکمێکی شەرعی لە زانایێك بکات کە بڕوای بە شارەزای و تەقواداری زانایەکە هەبێت کە بەمە دەگوترێت: لاسایکردن(تقليد)، کەسیش لێی رزگار نابێت و هەڵە نییە. بەڵام کاتێك زاناکە لەسەر موسڵمانە موقەلیدەکە واجب بکات، دەبێ بچیتە سەر فلانە مەزهەب تاوەکو بتوانم فلانە جەوابت بدەمێ!. ئەمە ترسناکترە لە ڕێگای ئەوانەی دژایەتی قوتابخانە فیقهییەکان دەکەن، چونکە ئەمە لەت لەت کردنی ئایینە لە دەروونی موسلماناندا هیچ بەڵگەیەکی لە سەر نییە، و ڕێگای دینداری نییە بەڵکو ڕێگای نەفامییە ـ خودا بمان پارێزێت ـ و هیچ کات پابەندبوون بە مەزهەبێکەوە وەکو ڕێگایەکی ئاسانکاری بۆ تێگەیشتن لە قورئانی پیرۆز و فەرموودەی پێغەمبەر ئەمە ناگەیەنێت.

کەواتە لە کۆتای وەڵامەکە با بەچەند سەردخاڵێك دەرچین:

١ ـ پابەندبوون بە مەزهەبە فقهییەکان تەنها بۆ ئاسانکاری تێگەیشتنە لە ئەحکامەکانی حەلاڵ و حەرام، بۆیەش تایبەتە بە ئەهلی علم.

٢ ـ دەمارگیری بو مەزهەبێك لە هەموو لق و پۆپەكانی، لاسایی كردنەوەیەكی كوێرانەیە و تاوانە ئەگەر بگاتە پلەیەك بلێت ئاوڕ لە فەرموودە نادەمەوە ئەگەر (صحیح)یش بێت لە بەر مەزهەبەكەم!

٣ ـ پشتگوێ خستنی گشت قوتابخانە فقهیەكان (مذاهب). بە بیانووی ئەوەی تەنها قورئانی پیرۆز و فەرموودەی پێغەمبەر بەڵگەن، دژایەتییە بو ڕێگای موسڵمان كە گشت زانایان یەك ڕان لە سوود وەرگرتن لە قوتابخانە فیقهییەكان.

٤ ـ تاكی موسڵمان بۆی هەیە پرسیار لە كەسێكی زانا و تەقوادار بكات بۆ فێربونی ئەحكامە شەرعییەكان لە حەڵاڵ و حەرام كە ڕۆژانە پێویستی پێدەبێ، وە نابێت ئیلزام بكرێت بە قوتابخانەیەكی فیقهی، هەرچەندە كە موقەلیدە. چونكە بۆی هەیە زانایەكی تەقوادار و شارەزا بۆ پرسیار لێكردن هەلبژێرێت یان زیاتر لە زانایەك، وە لەم هەلبژاردنەدا خۆی موجتەهیدە.

هەروەها بۆی هەیە پرسیاری بەڵگەوە بەدواداچوون بكات لەو زانایەی كە پرسیاری لێ دەكات لە سەر حوكمێكی شەرعی ئەمەش مانای ئەوەنییە كە پرسیاركردنی لە بەڵگە ئەوە دەگەیێنێت موجتەهیدە بەمانای فەتوادەر لە شتی نوێ (نوازل)، بەڵكو ئەوە دەگەیێنێت كە لە لاسایكردن(تقلید)ەوە دەرهاتووە بو شوێنكەوتنی بەڵگە(إتباع).

وە بوی نییە لە ڕووداوە نوێیەكاندا قسە بكات ئەگەر لاسایی كەرەوە(مقلد)بێ بۆ زانایەك یان شوێنكەوتەی بەڵگە(متبع)بێ، چونكە قسەكردن لە (نوازل) تەنها كاری زانای ئەهلی ئیجتهادە.

لە كوتایدا ئەو زانایانەی خزمەتی قورئان و فەرموودەیان كردووە، ئەگەر سەرپێچییەكیان هەبێ لەبەر ئەوەی فەرموودەیەكیان پێ نەگەیشتووە یان هەڵەیەكیان هەبێ لە لێكدانەوەیەكدا، ئەوا لە پلەو پایەیان كەم نابێتەوە (شیخ الإسلام ـ رحمه الله ـ) پەرتووكی

(رفع الملام عن الأئمة الأعلام) بۆ ئەم مەبەستە نووسیویەتی، وە (ابن عساكر ـ رحمه الله ـ) لە پەرتووكەكەی (تبين كذب المفتري ص٤١)موسڵمانان ئاگاداردەكاتەوە لە غەیبەت كردنی زانایان دەفەرمووێت: (إن لحوم العلماء رحمة الله عليهم مسمومة، و عادة الله في هتك أستار منتقصيهم معلومة...) واتە: (ئاگادارین غەیبەتی زانایان نەكەن، چونكە ئەگەر غەیبەت كردنی برات وەكو ئەوەبێ، كە بە مردوویی گۆشتی بخۆی، ئەوا غەیبەتی زانایان هەمان شتە، بەڵام زیاد لە وە گوشتەكەشیان ژەهراویە، وە تۆڵەسەندنەوە لە غەیبەتكار سوننەتێكی خودایيە...)

كەواتە ئەوانەی دژایەتی قوتابخانە فیقهییەكان و زانایانیان دەكەن با ئاگادارین لەم تاوانە، خودا هەموومان بپارێزێت.

بەڵگەكان لە قورئانی پیرۆزەوە:

**١ ـ بەڵگە لەسەر واجب بوونی پابەندی تەنها بە قورئانی پیرۆز و فەرموودەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم):**

﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا﴾[1] .

﴿فَلْيَحْذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِۦٓ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾[2]

﴿۞ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ وَلَا تُبْطِلُوٓا۟ أَعْمَٰلَكُمْ﴾[3]

﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا۟ تَسْلِيمًا﴾[1].

---

(١) (الأحزاب :٣٦).

(٢) (النور: ٦٣).

(٣) (محمد:٣٣).

٢ ـ بەڵگە لە سەر حەرام بوونی دەرچوون لە قسەی گشت زانایان وە حەرام بوونی دەهێنان (بدع) لە کاروباری ئایین.

﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْلَامَ دِينًا﴾[2]

﴿وَمَن يُشَاقِقِ الرَّسُولَ مِن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ الْهُدَى وَيَتَّبِعْ غَيْرَ سَبِيلِ الْمُؤْمِنِينَ نُوَلِّهِ مَا تَوَلَّى وَنُصْلِهِ جَهَنَّمَ وَسَاءَتْ مَصِيرًا﴾[3].

٢ ـ بەڵگە لە سەر دروستی لاسایکردن(تقلید) بۆ تاکی موسڵمان بە مەرجێك فێڵ لە خۆی نەکات لە هەڵبژاردنی ئەو زانایەی کە پرسیاری لێدەکات.

﴿فَسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾[4].

بۆ زیاتر بڕوانە:

* الموسوعة الفقهية الكويتية تأليف نخبة من العلماء (١/٤٠ ـ ٤١)

* الفقه الإسلامي و ادلته لدكتور وهبة الزحيلي (١/٩٠)

* أعلام الموقعين لإبن القيم المجلد الأول و الثاني منه (أو مجلد الفهرس ص/٦١٧ ـ ٦١٨ط مشهور حسن حيث مضان مباحث الفتوى و الريء و التقليد )

* كتاب: إيقاظ همم أولي الأبصار للإقتداء بسيد المهاجرين و الأنصار لمحمد بن نوح الفُلاّني.

* كتاب: هدية السلطان إلى مسلمي بلاد اليابان للخجندي.

* كتاب: بدعة التعصب المذهبي للعباسي محمد عيد.

---

(١) (النساء:٦٥).

(٢) (المائدة :٣).

(٣) (النساء:١١٥).

(٤) (النحل: ٤٣).

پرسیاری دووەم:

ئایا تێگەیشتنی دەقەکانی قورئانی پیرۆز بۆ عەقلی خوێنەرەکەی دەگەڕێتەوە، کە زمانی قورئان ئەزانێ؟ ئەگەر بڵێین نەخێر قورئان یاسا و ڕێسای خۆی هەیە بۆ تێگەیشتن، ئایا ئەم یاسایانە هەر عەقلی خوێنەر دایان نەناوە !؟ ئایا ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە قورئانی پیرۆز وەکو هەویرێك بێ لە دەست خەڵکی خوێنەر، هەریەکەو بە ئارەزووی خۆی شێوەیەکی لی دروست بکات، وە بڵێت ڕاستی لەگەڵ منە بە بەڵگەی فلان ئایەت !؟ وە ئەگەر هەر گفتوگۆیەکی هێمنانە لەگەڵ بکەی، دەڵێت ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز زۆر ڕوو هەڵدەگرن (القرآن حمالة الوجوه!!).

وەڵام:

بۆ وەڵام دانەوەی ئەم پرسیارە ڕەچاوی پێنج خاڵ دەکرێت:

یەکەم / قورئانی پیرۆز بە زمانی عەرەبی دابەزیوە ﴿بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُّبِينٍ﴾[1] واتە: (قورئانی پیرۆز بە زمانێکی عەرەبی ڕوون و ئاشکرا دابەزیوە).

دووەم/ پێغەمبەرمان (صلی الله علیه و سلم) بەیانی ماناکانی کردووە ﴿وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ﴾[2] واتە: ئەی محمد ئێمە ئەم قورئانەمان بۆ تۆ دابەزاندووە، تاوەکو بو خەڵکان ڕوون بکەیتەوە کە چۆن کاری پێ بکەن.

سێ یەم / بەیانی پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) بو قورئانی پیرۆز سرووشە(وحی) ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَىٰ - إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ﴾ واتە: (گۆتنەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) لە هەواو هەوەسەوە نییە، بەڵکو گشتیان (وەحی) ئاسمانە ).

---

(١) (الشعراء: ١٩٥).

(٢) (النحل:٤٤).

بۆ نموونە ئەرکانەکانی ئیسلام ـ ئەوانەی کردەوەن (عمل) ـ هیچیان چۆنیەتییان لە قورئاندا نییە، بەڵکو پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) چۆنیەتییەکەیان بە فەرموودە بۆ موسڵمانان ڕوون کردووتەوە.

چواردەم / بنەماکانی ئایین کە لە قورئان و فەرموودە وەرگیراون وەکو ئەرکانەکانی ئیمان و ئیسلام، وە پاراستنی ئایین وسەر و ماڵ و عەقل و شەرەفی تاکەکەسان، گشت موسڵمانان لە سەر ئەم بنەمایانە هاوڕان بە بێ جیاوازی، و خودای پەروەردگار موسڵمانی پاراستووە، کە تووشی گومڕاوی بن وە لەم بنەمایانە دوور کەون بە تێکڕایی، هەر وەك لەم فەرموودەیەدا هاتووە: ((إن الله قد أجار أمتي من أن تجتمع على ضلالة))[١] هەر لەبەر ئەمەش پەروەردگار ئوممەتی ئیسلام بە ئوممەی دادپەروەر(أُمَّةً وَسَطاً) ناو دەبات: ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَـٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا﴾[٢] .

پێنجەم / ئەگەر ئەم چوار خاڵانەمان زانی، پێویستە بزانین کە هەر لێکدانەوەیەکی قورئانی پیرۆز بە زمانی عەرەبی سەرپێچی بێ بۆ بەیانکردنی پێغەمبەرمان (صلی الله علیه و سلام) بۆ واتاکانی قورئان، یان سەرپێچی بێت بۆ ئەو بنەمایانەی کە موسڵمانان لە سەری هاوڕان بە بێ جیاوازی، ئەوا لێکدانەوەیەکی هەڵەیە.

وە پەروەردگار گەف لە هەڵەکارەکە دەکات بە دۆزەخ: ﴿وَمَن يُشَاقِقِ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ ٱلْهُدَىٰ وَيَتَّبِعْ غَيْرَ سَبِيلِ ٱلْمُؤْمِنِينَ نُوَلِّهِۦ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصْلِهِۦ جَهَنَّمَ وَسَآءَتْ مَصِيرًا﴾[٣] واتە: (هەرکەسێك پاش ئەوەی ڕێی ئیسلامی بۆ ڕوون بۆیەوە، سەرپێچی پێغەمبەرـ صلی الله علیه وسلم ـ بکات، وە پشت لە ڕێبازی موسڵمانان بکات لە تێگەیشتنی قورئانی

---

(١) رواه بنحوه الترمذي ٢٣٠٥و احمد ٢١٢٩٣و غيرهما.

(٢) (البقرة :١٤٣).

(٣) (النساء :١١٥) .

پیرۆزو و فەرموودەی پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلام)، ئەوا رووی لە دۆزەخ و خراپترین چارەنووس دەکەین ).

کاتێ ئەم پێنج خاڵەمان لە بەر چاوبێت بومان روونده‌بێتەوە کە:

١ ـ **مەبەست لە** ﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴾[١] **تەنها پاراستنی دەقەکانی قورئان نییە، بەڵکو پاراستنی مانایەکەیەتی، چونکە هەموو مرۆڤێکی ژیر دەزانێت کە پاراستنی پەروەردگار بۆ دەقێك بە بێ پاراستنی ماناکەی هیچ سوودێکی نییە بۆ مرۆڤ، ئەمەش هەرگیز نابێت چونکە دژە بۆ حیکمەتی خودای پەروەردگار.**

٢ ـ **بۆمان روون دەبێتەوە کە ئەوانەی وشەی (القرآن حمالة الوجوه) بە هەواو هەوەسی خۆیان و بۆ هەواو هەوەسی خۆیان بەکاری دێنن، خەڵکانێکن لە سەر رێبازی موسڵمانان** ﴿ سَبِيلِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾ **نیــن، رێبازی ئەو موسڵمانانەی کە پەروەردگار لێیان رازی بووە و ئەوانیش لە پەروەردگار رازی بوون، لە کۆچبەرانی مەککە و ئەوانەی پاڵپشتیان بوون لە مەدینە و ئەوانەی بە درێژایی زەمان شوێنکەوتەی ئەوانن لە تێگەیشتن و کارو کردەوە کردن بە قورئانی پیرۆز و فەرموودەی پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) هەر وەك پەروەردگار دەفەرمووێت:** ﴿ وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلْأَوَّلُونَ مِنَ ٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحْسَٰنٍ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى تَحْتَهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴾[٢]

بۆ زیاتر بڕوانە:

*** مقدمة في أصول التفسير لشيخ الإسلام أحمد ابن تيمية بشرح الشيخ صالح آل الشيخ و شرح الشيخ مساعد بن سليمان الطيار.**

---

(١) (الحجر:٩).

(٢) (التوبة: ١٠٠).

# سێ کورتە بابەت

# کە پێویستیان بە درێژە پێدان هەیە!

## یەکەم:

### سێ وێنە لا پەڕە!

وێنەی (١)

الصلاة القانونية الاسلامية

La Prière Canonique Musulmane

...ن مستشرقو الغرب بالبحث عن الآثار الكردية الأ منذ مائة سنة على
...الغرب والكتب الكردية نادرة جداً ويظن موسيو هوار ناشر هذه الرسالة
...هذه القصيدة الكردية اي (الصلاة القانونية الاسلامية) هي اقدم ما عرف من آثار
...لكرد لان دواوين الشعراء الثمانية الذين ذكرهم اسكندر جابا خافية عن الابصار .
والقصيدة مجهول صاحبها ، وقد اتى فيها الشاعر الكردي على بيان شرائط
...الصلاة واركانها واقسامها ، وهيآتها ، . —
...ترجم القصيدة موسيو هوار من الكردية الى الفرنسية في رسالة تحتوي على
...ثمان بعشرين صفحة . —

**وێنەی (٢)**

﴿ المجلد الأول من ﴾

# كتاب

مجموعة فتاوى شيخ الاسلام تقى الدين
ابن تيمية الحرانى المتوفى سنة ٧٢٨

طبع بمعرفة صاحب الهمة العلية * والسيرة المرضية * ( حضرة
الفاضل الشيخ فرج الله زكى الكردى الازهرى )

وذلك بمطبعته ﴿ مطبعة كردستان العلمية ﴾ بدرب المسمط
بملك سعادة المفضال أحمد بك الحسينى بجمالية
مصر القاهرة سنة ١٣٢٦ هجريه

﴿ تنبيه ﴾

ن أراد هذا الكتاب * واعلام الموقعين * ومستصفى الغزالى * وشرح تحرير الاصول *
كشف الاسرار * وشروح التلخيص * وشرح تهذيب الكلام * وشرح منظومتى
الكواكبى * وحواشى شرح الشمسية ومتن مسلم الثبوت مع المنهاج والمختصر
وغيرها يطلبها من ملتزم طبعها ﴿ فرج الله زكى الكردى بمصر ﴾

وێنەی (٣)



کوردستان

برای خۆێنەر ئەم سێ وێنە لاپەرەیە کە دەیان بینی هەریەکەیان کورتە بابەتێکە کە پێویستی به درێژە پێدان هەیە:

## وێنەی یەکەم:

## وێنە لاپەڕەیەکە باس لە کۆنترین دەستنووسی کوردی دەکات !

ئەگەر کەسانێك لێمان بپرسن، ئایا باپیرانتان خوێنەواربوون وە بەزمانی خۆیان نوسینیان هەیە؟ ئەوا وڵامدانەوەکەی زۆر قورس دەبێت، جۆنکە ئەگەر بلێین: بەلێ، داوای بینینی دەستنووسەکانیان دەکەن کە بەزمانی کوردی نووسرابن! ئەمەش شتێکی ئەستەمە. ...

دەبێ دەستنووسەکانیان لە کوێ بی؟ وە چۆن بەدوایاندا بگەڕێین؟ یان چۆن کۆیان بکەینەوە؟ کێ بەرپرسە لەمە؟ یان کێ کاری بو ئەمەکردووە؟ یان کێ بیر لەمە دەکاتەوە؟

وەلامی ئەم پرسیارانە با بە هەلۆاسراوی بمێنێتەوە، خوێنەری بەرێز فەرموو بڕوانە لاپەڕی (٨٥) ی بەرگی (٤) (مجلە المجمع العلمی العربی الدمشقی١٩٢٤م) بخوێنەوە. کە (وێنە لاپەرە)ی یەکەمە. لەم لاپەڕەیەی (**مجلة المجمع العلمی العربی - دمشق -**) باس لەوە دەکرێت کە کۆنترین دۆزراوەی **دەستنووسی کوردی بە تێڕوانینی** ڕۆژهەلاتناس (موسیو هوار): هونراوەی (**نوێژی قانونی ئیسلامی)یە کە نووسەرەکەی نادیارە**، وە ئەم ڕۆژهەلاتناسە دەستنووسەکەی **لە** زمانی کوردییەوە بۆ فەرەنسی وەرگێراوە **لە نامیلکەیەکی** بیست وهەشت لاپەڕەییدا، کە باس لە چۆنیەتی نوێژ کردنی موسلمانان دەکات.

لە کۆتاییدا....تۆ بلێی خەخۆرێك هەبێ بەدوای ئەم دەستنووسەدا بگەڕێ، وە دەیان دەستنووسی وەکو ئەو، کە بە زمانی شیرینی کوردی نووسراون. تاوەکو ئێمە بەو کەسانەی کە پرسیاری خویندەواری باپیرانمان لێدەکەن بلێین: بەلێ باپیرانمان خوێندەوار بوون، ئەمەش دەستنووسەکانیانە کە بۆ سەدان سالْ دەگەڕێنەوە.

## وێنەی دووەم:

## وێنەی لاپەرەیەکی چاپێکی کۆنە ناوی وەلاتەکەمانی لەسەرە - کوردستان -!

پێنج بەشەکەی (الفتاوی الکبر)ی (ابن تیمیة - رحمه الله - ) لە سێ بەرگی گەورەدا کە لەسالانی (١٣٢٦ - ١٣٢٩هـ) لە چاپ دراون، لە لاپەڕەی ناونیشان نووسراوە (**مطبعة** کردستان العلمیة) وەکو لە وێنەیەدا دەیخوێنیتەوە، وە لە ژێرەوەی (وێنە لاپەڕە)کە ناونیشانی چەند بەرهەمێکی چاپخانەکە دەیخوێنیتەوە. پرسیارەکە ئەوەیە ئەم جۆرە چاپانە کەناوی وەلاتەکەمان هەلدەگرن - کردستان - وە تەمەنی سەد سالْ زیاتریان تێپەڕاندووە تۆ **بلێی خەخۆرێك** نەبێ ئاوڕیان لێبداتەوە [١] ؟

(١) ینظر: الرسائل المتبادلة بین جمال الدین القاسمي و محمود شکري الالوسي ص\٤٣، ٤٨ و الأخبار التاریخیة في السیرة الزکیة لزکي مجاهد ص\١٢٣ و المدخل لآثار شیخ الإسلام ص\٩١ و فتاوی رشید رضا ٦\٢٣٩١ .

## وێنەی سێیەم:

### وێنەی لاپەڕەی یەکەمی یەکەم ڕۆژنامەیە بەناوی وڵاتەکەمان ـ کوردستان ـ :

ڕۆژنامەی(کوردستان ) یەکەمین ڕۆژنامەی کوردییە (١٨٩٨ز ـ ١٩٠٢ز ) یەکەم بابەتی لاپەرە یەکەمینەکەی پاش (بسم الله الرحمن الرحیم )، بە(حَمْد) واتە سوپاسگوزاری بۆ خودا دەستپێدەکات کە ئەمە دەقەکەیەتی: **(سەد هەزار شوکر و حەمد ژ خودێ تەعالا را ئەم موسلمان خەلق کرین).**

یەکەم وشەی زانایان و دانایان لە لاپەڕەی یەکەمی ئەم ڕۆژنامەیە فەرمودەیەکی پێغەمبەرمانە(صلی الله علیه وسلم)، کە دەفەرمووێت: زانایان میراتگری پێغەمبەرانن، ئەمە دەقەکەیەتی: **(پێغەمبەر علیه الصلاة و السلام گوتی یە: العلماءُ ورثةُ الأنبیاء).**

ئەم دەستپێکە لە یەکەم لاپەڕەی یەکەم ڕۆژنامەی کوردیدا جێی گەشبینیی یە، چونکە ئەگەر کاروانی ڕۆژنامەوانی کوردی بەم مانا پیرۆزانە دەستی پێکردبێ، ئەوا هەر بۆ ئەم مانا پیرۆزانە دەگەڕێتەوە.



## دووەم:

## سێ لاپەڕە لە سیاسەت!

### لاپەرەی یەکەم:

### سایکس بیکو (١٩١٦/٣/٤)

ئەوانەی وڵاتی ئێمەیان پارچە پارچە کرد پێش سەد ساڵی رەبەق، ئەم دەزانی بوچی ئەم ستەمەیان ئەنجامدا؟ دژ بە گەلێك کە زۆر بە پەرۆشە بۆ دۆستایەتی گەلان!؟

ئایا لەبەر ئەوە بوو کە کوردین؟ یان لەبەر ئەوەبوو کە موسڵمانین؟ یان لەبەر چەند هۆکارێکی تر کە من و تۆ نازانین؟. ...

زۆر لە مێژە ئەم پرسیارانەم لەگەڵ خۆم دووبارە دەکردەوە، تاوەکو قەدەر لاپەرەیەکی مێژووی خستە بەرچاوم تیایدا بوو: رۆژی پارچەپارچەکردنی وڵاتەکەمان ـ کردستان ـ بە پەیماننامەی سایکس بیکو، هەمان رۆژی مردنی پاڵەوانی کوردی موسڵمانە (صلاح الدين الأيوبي)یە! ئەوکات وەڵامەکەم زانی. ..



## لا پەڕەی دووەم:

## چاکسازی لە نێوان شۆڕەش دژی دەسەلاتی سیاسی وە پەروەردە بۆ نەوەکانی داهاتوو؟

شێخی سەرۆك (محمد كرد علي) لە (المذكرات ١٢٠٦/٤) سەبارەت بە شۆڕەشی گەلی سوری دژ بە فەڕنسییەکان دەفەرمووێت: ئەمە شۆڕشێکی زیان بەخش بوو بەرامبەر میللەتی سوریا: ماڵەکان کاول بوون، خەڵك کوژران، کارگەکان لە کار وەستان. ... هەروها شێخی سەرۆك بو ئەوە دەچێت کە شۆڕشەکان زیانیان لە قازانجیان زیاترە وە لە پەرتووکەکەی: (دمشق مدينة السحر و الشعر) بەدرێژی باس لەم بابەتە دەکات.

ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی سەرانی شورەش تورەیی خۆیان دژی دەربڕن، وە لەوانە سەرۆك کۆماری ئەو کات کە نووسەرد پەنجەفرۆشەکان دژی بەکاردێنی....

جێی مەبەست لە باسەکەماندا ئەوە نییە باس لە چاکە و خراپەی شۆڕەشی ئەوکات بکەین، بەڵکو ئەوەیە ئەگەر شیخی سەرۆك (محمد كرد علي) ئەمڕو لە ژیاندا با دیمەنە وێرانەکانی شورەشی ئەمڕوی سوریای بینیبا چی دەفەرموو؟

وەڵام: وتەیەکی زانای ناودار (حسن البصري ـ رحمه الله ـ) دووبارە دەکردەوە کە بە خەڵکی تورەی دژ (حجاج) دەی فەرموو:

((ئەی خەڵکینە! ستەمی کاربەدەست سزای خودایە بۆ ئێمە بەرامبەر کارە خراپەکانمان، نەکەن بە شمشێر وەڵامی بدەنەوە، بەڵکو بە گەڕانەوە بۆ خودا و زۆری نزاکردن وەڵامی بدەنەوە!))[1].

---

(١) ينظر: طبقات ابن سعد ١٦٥/٩ ط الخانجي.

## لا پەڕەی سییەم:

## قـاعیدە و داعش و هاوشێوەکانیان

### (كلاب أهل النار) سەگەکانی خەڵکی ئـاگر

دەبێ کەسانێك لە چ ئاستێکی خراپیدابن، کاتێ پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) بە سەگی خەڵکی ئاگر وەسفیان بکات (كلاب أهل النار!!)[١]

ئەمانە کەسانێکن خراپەیان لە وەدایە کە کردەوە خراپەکانیان، لە بەکافردانانی موسڵمانان و کوشتنیان بە دڕندەترین شێوە، بە خوداپەرستی و چاکە دەژمێرن!!.

وە خراپەکارییان لە ئاستێك دایە، کە گەورەترین هۆکاری دوور کەوتنەوەی خەڵکین لە ئیسلام !.

ئەمانە لەم سەدەیەدا بە ناو (قاعیدە) و (داعش) و دەیان ناوی تر دەرکەوتوون، خەڵکی ئاگر لەو دەزگایانەدا کە دژ بە ئیسلام و موسڵمانان کاردەکەن، پڕ چەکیان کردوونە و وەکو سەگ بەکاریاندێنن دژ بە ئیسلام و موسلمانان. بەڵام با موسلمانان هەرگیز نائومید نەبن، بەدرێژایی مێژوو ئەم جۆرە پیلانانە بەسەر دوژمناندا شکاونەتەوە، وە بە چاکەی موسڵمانان کۆتایی هاتوون.

داوا لە خودای پەروەردگار دەکەین بۆ خاتری ناوە جوانەکانی و سیفەتە بەرزەکانی ئیسلام و موسڵمانان، بەتایبەت گەلی کورد و پێشمەرگە موسڵمانەکانمان لە شەڕی شەرانگێزان و پیلانی پیلان گێران بپارێزێت[٢].

---

(١) أخرجه ابن ماجة١\١٢٢ وغيره، ينظر المسند المصنف المعلل ٢٦\١٥٣ ـ ١٥٧.

(٢) ينظر: كتاب الخوارج ـ نشأتهم، فرقهم، الرد على أبرز عقائدهم لشيخ سليمان الغصن و كتاب: القصة الكاملة لخوارج عصرنا القاعدة و داعش و أخواتها رسالة جامعية.

تێبینی: بۆ زیاتر وەرگرتنی زانیاری لە سەر بیری خەوارج و داعشەکانی ئەمڕۆ بڕوانە ئەم

سەرچاوانە:

١ـ داعش العراق والشام . تألیف علي حسن الحلبي.

٢ـ القصة الكاملة لخوارج عصرنا القاعدة- داعش وأخواتها . اعداد ابراهيم بن صالح الحميد.

٣ـ خوارج نشأتهم. فرقهم. صيفتهم. الرد على أبرز عقائدهم. تأليف سلمان الغصن

وە زۆر پێویستە لەم رۆژگارەدا ئەم جۆرە سەرچاوانە وەربگێردرێنە سەر زمانی کوردی.

## سێیەم:

# سێ لاپەڕە لە مێژوو

### لاپەڕەی یەکەم:

### سەرهاتی قەڵای رۆمللی ساڵی ١٤٥٢ز !

قەڵای (رۆمللی) کەلە ساڵی (١٤٥٢م) سوڵتانی عوسمانی موسلمان (محمد الفاتح) بۆ فەتحکردنی (القسطنطينية ـ ئیستەنبول ـ ) ئاوەدانی کردبوو، ئەم قەڵایە توانی ئەرکی خۆی ببینێ لە فەتحکردنی شارەکە، کە زیاتر لە هەزار ساڵ پایتەختی خاچ پەرستەکان بووە.

بۆیە هەر لەو کاتەوە خاچ پەرستەکان بیریان لە رۆخاندی ئەم قەڵایە دەکرد، وە دەیانزانی ئەم کارە لە توانایاندا نییە لە بەر باڵادەستی دەوڵەتی عوسمانی لە رووی هێزی سەربازییەوە، بەڵام سەرەڕای ئەمە لە ساڵی (١٨٦٣م) توانیان ئەم کارە ئەنجام بدەن لە بەر چاوی عوسمانییەکان و لە ناو جەرگەیاندا ! نەك بە چەك و تەقەمەنی ! یان بەئامێری گەورەی رۆخێنەر ! بەڵکو تەنها بە دروستکردنی قوتابخانەیەکی دواناوەندی خاچ پەرستان لە تەنیشت قەڵاکە!، کە (هاملین)ی بانگخواز بۆ خاچ پەرستی پیلانی بۆ دانابوو، وە دەی گوت:

تورکە موسڵمانەکان قەڵایەکیان دروستکرد بۆ فەتحکردنی ئیستەنبول، وە ئێمە قوتابخانەیێك دەکەینەوە بۆ لە ناوبردنیان لە هەمان شوێن !.

(هاملین)لە کارەکەی سەرکەوتوو بوو وە لە گەڵ جولەکەی سەرمایەدار (روشلد) ڕێکەوت بو جێبەجێ کردنی پیلانەکە، وە (أحمد وفیق پاشا)ی خۆ فروش - جاش - زەویەکەیان لە جێگای پێویست تەنیش قەڵای (ڕۆمللی) بویان ئامادەکرد و پێیان فرۆشت.

(سوڵتان عبد الحمیدی دووەم) کاتێ هەواڵی مردنی (أحمد وفیق پاشا)ی پێگەیشت، فەرمانی دەرکرد وەکو سزایەك گورەکەی لە تەنیشت قوتابخانەکەی خاچ پەرستان بێت لە (ڕۆمللی)، تاوەکو گوێبیستی زەنگی خاچ پەرستی ئەو (پروستانتانە)بێت کە زەویە کەیان پێ فرۆشتووە!! بەڵام (سوڵتان عبد الحمیدی دووەم)نەیدەزانی کە ڕۆخێنەرانی دەوڵەتەکەی لە سەر دەستی دەرچووانی قوتابخانەکە دەبن، لە وانە (أتاتورك) دانەری دەولەتی تورکی لادینی! کە لە سالی (١٩٢٤ز) نەك تەنها بریاردرا خەلافەتی عوسمانی لابدرێت، بەڵکو لە هەمان کاتدا بڕیار درا گشت قوتابخانە ئایینیەکان کە پەیوەندیان بە فێرکردنی ئیسلامەوە هەیە دابخرێن[1] !

## لا پەڕەی دووەم:

### نامەیەکی ناپلیون بۆ خەلیفەکەی جەنەڕاڵ کلیبەر لە میسر ساڵی١٧٩٩ز

نامەیەکی سەرکردە ناودارەکەی فەرەنسا (ناپلیون) بۆ خەلیفەکەی لە میسر جەنەڕاڵ (کلیبەر)، کە وەکو بەڵگەنامە بە ژمارە (٤٣٧٣) لە ئەرشیفی وەزارەتی جەنگی فەرەنسی پارێزراوە، دواتر وەرگێڕاوە بۆ سەر زمانی عەرەبی، تیادا هاتووە:

---

(١) ينظر: (محمد الفاتح) لدكتور سالم رشدي ص\٤٧ و المدارس العالمية الأجنبية الإستعمارية تأريخها و مخاطرها لشيخ بكر أبو زيد ص٢٨، ٤٤ و الصهيونية للمسيري ٨\٩٢، ٦\١٧٩ـ١٨٠، ٣\١٢٥ـ١٢٨.

(سأرسل لك جوقة تمثيلية للبدء في تغيير تقاليد البلاد) واتە: بۆ دەستپێکردن لە پرۆژەی گۆڕینی دابونەریەتی خەڵکی میسر تیپێکی هونەری بۆت بەرێدەکەم!!. ئەمە بەکارهێنانی هونەرە بۆ رۆخاندنی پایە بەرزەکان، چونکە دابونەریەتی ئیسلامی لە ناو گەلە موسڵمانەکان، بە چەك و تەقەمەنی لە ناوناچێت، بەڵام بەهونەرێکی بەرەڵا دژ بە خۆڕەوشتی موسڵمانان، مانەوەیان لە مەترسیدایە [١].

## لا پەڕەی سێیەم:

## هەوڵدان بۆ دەرهێنانی

## یەکەم فلیمی سینەمایی لەسەر کەسایەتی

## پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم) سالی ١٩٢٦ز

دژایەتی کردنی پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم) لە یەکەم رۆژی بانگەوازەکەی بۆ پەیامی (لا إله إلا الله محمدٌ رسول الله) دەستی پێکردووە، وە بەردەوامە و بەردەوامیش دەبێت، بەڵام شێوازەکانی ئەم دژایەتییە بە پێی سەردەمەکانەوە دەگۆڕدرێت.

لە بەراییە کانی سەردەمی تەکنەلوجیا، هەوڵدرا بۆ ئەوەی کەسایەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وەکو هەرکەسایەتییەك پیشانی مرۆڤایەتی بدرێت، بۆ ئەم مەبەستە یەکەم هەوڵ ئەوە بوو کە پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم) بکرێتە پاڵەوانی فلیمێك! بۆ ئەوەی وەکو هەرپاڵەوانێکی تری دونیا بێت کە لە فلیمەکاندا دەبینرێن.

ئەم بیرۆکەیە مرۆڤێکی تورك بەناوی (وداد عرفی) پارەیەکی زۆری بۆ تەرخانکرد، وە هونەرمەندی میسری (یوسف وهبـی) بڕیاربوو بە کارەکە هەڵسێت وە دەوری کەسایەتی پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم) ببینێت.

(١) ينظر: كتاب المتنبـي لمحمود شاكر ص\١٠٩ و فتح مصر لحافظ عوض ص٤٠٧ـ٤١١.





بەڵام ئەوەی جێی ڕێزو سوپاسە، زانایانی (ئەزهەر) دژی ئەم پرۆژەیە وەستان وەنەیان هێشت ئەنجام بدرێت، ئەمەش لاپەڕەیەکی سپییە لە مێژووی زانکۆی ئەزهەردا.

ئەوەی لە هەموو سەیرتر لێرەدا ئەوەبوو کە پاش پۆچەڵبوونی ئەم پرۆژەیە، دەرکەوت کە (وداد عرفي) ـ خاوەنی بیرۆکەی فلیمەکە و پاڵپشتکاری فلیمەکە بە پارەیەکی زۆر ـ موسڵمان نییە بەڵکو جولەکەیە![1] .

## گەشبینی بە دوا لاپەڕە

وەکو پابەندبوون بە شوینکەوتنی پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) کە حەزی لە گەشبینی بووە (كان يحب الفأل الحسن)[2] لە دوا لاپەڕەی گۆڤارەکەماندا، گەشبینی خۆمان بە دوا لاپەڕەی چەند پەرتووکێك دەردەخەین لەوانە:

### * دوا لاپەڕەی صەحیحی ئیمامی بوخاری:

پێشەوای فەرمووەناسان (بوخاري ـ رحمه الله ـ ) بە فەرموودەی: (كلمتان حبيبتان إلى الرحمن، خفيفتان على اللسان، ثقيلتان في الميزان: سبحان الله و بحمده سبحان الله العظيم) (رقم: ٧٥٦٣) پەرتووکەکەی (الجامع المسند الصحيح المختصر من أمور رسول الله صلى الله عليه وسلم و سننه و أيامه ـ کە ناسراوە بە: صەحیحی بوخاری ـ ) کۆتایی دێنێت، کە دووەم پەرتووکی موسڵمانانە پاش قورئانی پیرۆز، وەکو گەشبینییەك کە دوا لاپەڕەی ژیانی وەکو دوا لاپەڕەی پەرتووکەکەی زیکر و ستایشی خودا بێت.

---

(١) ينظر: تاريخ السينما في مصر ص١٩٩ وما بعدها، وأحكام فن التمثيل في الفقه الإسلامي ص١٧٩ـ ١٨٠.

(٢) أخرجه أحمد ١٤\١٢٢.





## * دوا لاپەڕەی (سنن الكبير)ی ئیمامی بەیهەقی

پێشەوای فەرموودە ناس (بەیهەقی - رحمە اللە -) بە بابەتی (العتق) واتە ڕزگارکردنی کۆیلە پەرتووکەکەی (السنن الكبير) کۆتایی دێنێت، وەکو گەشبینییەك، کە چۆن دوا بابەتی پەرتووکەکەی ڕزگاربوونی کۆیلە یە، بە هەمان شێوە دوا لاپەڕەی ژیانی ڕزگاربوون بێت لە زەحمەتی ژیان بۆ ڕەحمەتی پەروەردگار.

## * دوا لاپەڕەی (معجم شيوخ تاج الدين سبكی) = دوا لاپەڕەی گۆڤارەکەمان.

دوا لاپەڕەی یەکەم ژمارەی گۆڤارەکەمان بە نزایەك کۆتایی دێنین، کە لە دوا لاپەڕەی پەرتووکی(معجم الشيوخ لتاج الدين السُبكي)دا هاتووە (ص ٦٣٢):

(اللهم نَشكوا إليك:

سَفَه أحلامنا ،

و نقصَ عِلْمنا ،

و اقتراب آجالنا ،

و ذهاب الصالحين منّا)

بە هیوای ئەوەی دوا لاپەڕەی ژیانمان ژیرییەك بێت دڵمان بە ئیمان خاوێن بکاتەوە ، وە زانستێك بێت کردەوکانمان بە ئیسلام بڕازێنێتەوە.

وە ئەوەی زیاتر دڵمان پێی گەشاوە بیرمان پێی گەشبین بوو، ئەوە بۆ کە گۆڤارەکەمان دوا لاپەڕەی بە ژمارە (١١٤) کوتای هات کە کۆی سوورەتەکانی قورئانی پیرۆزە.